سەردەمی گوڵین-٤

حەزرەتی

# عوسمان

ڕەزای خوای لێبێت

ڕوحی دەمیرەل



سەردەمی گوڵین -٤-

حەزرەتی

# عوسمان

ڕەزای خوای لێبێت

ڕوحی دەمیرەل




# سەردەمی گوڵین
# ٤
# حەزرەتی عوسمان
## ڕەزای خوای لێبێت

نووسینی: ڕوحی دەمیرەل
وەرگێڕانی: دەستەی وەرگێڕانی دەزگای چاپ و پەخشی کانی عیرفان
چاپی یەکەم: مایس - ٢٠١٤
لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی
(٤٢٧)ی ساڵی (٢٠١٤)ی پێدراوە
تیراژ: ٣٠٠٠

شوێنی چاپ
Neşe
Neşe Matbaacılık - İstanbul - TURKEY
+90 212 886 83 30
www.nesematbaacilik.com



دەزگای چاپ و پەخشی کانی عیرفان
www.irfanpublishing.com

گوندی ئینگلیزی خانووی ژمارە ٩ / هەولێر
+964 (0) 750 713 80 00

# ناوەرۆک



# خەونی بەدیهاتوو

کاروانێکی دوور و درێژ هێدی هێدی لە بیاباندا ڕێی دەکرد. باری وشترەکان پڕ بوو لەو کاڵایانەی لە شامەوە هێنرابوون.

کاروانچییەکان لە ترس و دڵەڕاوکێدا بوون. لەبەر ئەوەی دز و جەردە لەو ناوەدا بە ئارەزووی خۆیان دەسوڕانەوە، هەر بۆیە ڕێگاکان

هیچ ئارام نەبوون و مەترسیدار بوون. لەو بیابانەدا پیاو کوشتن و کاروان بڕین وەکو ئاو خواردنەوەی لێهاتبوو.

سەرۆکی کاروانچییەکان هاواری کرد:

- ڕاوەستن! وشترەکان تەواو ماندوو بوون. با ماوەیەك لێرەدا پشوو بدەین، پاشان بەردەوام دەبین. دەی خێرا بارەکانتان داگرن.

یەکسەر هەموو کەوتنە جوڵە و چوون بەلای وشترەکانەوە. وشترەکان چۆکیان دادا و بارەکان داگیران. ئیتر کاروانچییەکانیش چونە قەدپاڵێکەوە و پاڵیان لێدایەوە. چەند کەسێکیان بوونە ئێشکگر و ئەوانی تریش نوقمی خەو بوون.

یەکێک لە کاروانچییەکان کە پیاوێکی سی و چوار ساڵەی سەر و ڕیش پڕ بوو، چاوێکی بە کاروانەکەدا گێڕا. ئەم کاروانچییە حەزرەتی عوسمان (ڕەزای خوای لێبێت) بوو. تەنانەت گەر بە تەنیاش بووایە، ئەوا هەمیشە بزە لەسەر لێوی بوو. ئیتر کاتێک ئەم پیاوە دەم بەخەندەیە بینی وا ئێشکگرەکان شوێنی خۆیان گرتووە و دامەزروان، ئەمیش چاوەکانی لێکنا و لەتاو ماندوێتی ئەوەندەی نەبرد خەوی لێکەوت.

لەو ماوە کورتەی کە تێیدا سەرخەوێکی شکاند، لە خەونیدا پیاوێکی بینی کە بەناو کاروانەکەیاندا هاتوچۆی دەکرد. ئیتر کاتێک ئەم پیاوە حەزرەتی عوسمانی دەبینێت، بەرەو ئەو هەنگاو دەنێت و پڕ بە قوڕگی خۆی هاوار دەکات: "ئەی خەوتووان هەستن! وا ئەحمەد لە مەککە پێغەمبەرایەتیی خۆی ڕاگەیاند."

حەزرەتی عوسمان بەشڵەژاوییەوە لەخەو ڕاپەڕی. یەك دوو جار چاوەکانی تروکاند و تەماشایەکی دەوروبەری خۆی کرد. ئەو ناوە ئێجگار کش و مات بوو. وشترەکانیش بۆخۆیان کاوێژیان دەکرد و پاسەوانەکانیش هێشتا لە ئێشکگرتندا بوون. هاوڕێکانیشی لە شیرینەی خەودا بوون. حەزرەتی عوسمان هەر بیری لە خەونەکەی دەکردەوە و وێنەی ئە پیاوەی لە خەونەکەیدا بینیبووی لە پێشچاوی لا نەدەچوو. دەیوت باشە دەبێت ئەحمەد کێ بێت؟

پاش ماوەیەك کاروانەکە سەرلەنوێ کەوتەوە ڕێ. لەکۆتاییدا گەشتنە مەککە و شمەکەکانیان داگرت و دەستیان کرد بە فرۆشتنی. لەماوەیەکی کەمدا هەموو بارەکانیان فرۆشت.

حەزرەتی عوسمان بەدەم بیرکردنەوە لە خەونەکەیەوە دەستی کرد بەگەڕان. بەلای کەعبەدا تێپەڕی و بۆ ماوەیەک بە قووڵی ڕوانییە خەڵکی ئەو ناوە. بینی وا لە حەوشەی کەعبەدا هەندێ بتی لێیە و خەڵکەکەش خەریکی بت پەرستین.

حەزرەتی عوسمان (ڕەزای خوای لێبێت) ویستی بڕوات بۆ شوێنێکی تر. بەڵام لەو کاتەدا یەکێک دەستی خستە سەرشانی. هەربۆیە چاوی لەسەر بتەکان لادا و ڕووی کردە خاوەنی دەستەکە. ئەوە حەزرەتی ئەبوبەکر بوو، هاوڕێی نزیك و خۆشەویستی.

ئەوەندە نەدەبوو کە حەزرەتی ئەبوبەکریش (ڕەزای خوای لێبێت) موسوڵمان ببوو. هەر بۆیە، یەکە یەکەی هەموو هاوڕێ نزیکەکانی خۆی بەسەر دەکردەوە و باسی ئیسلامی بۆ دەکردن. ئەوەبوو لەگەڵ حەزرەتی عوسماندا ماوەیەك بێ ئەوەی هیچ بڵێن تەماشای

یەکتریان دەکرد. پاشان ئەم دوو هاورێیە دەربارەی بتەکان و بت پەرستی، کەوتنە گفتوگۆ. قسە هات و ڕۆیشت تا گەیشتنە سەر بابەتی ئەوەی چۆن مرۆڤەکان بتوانن بە ئاسوودەیی بگەن؟!

بۆیە حەزرەتی ئەبوبەکریش ئەم دەرفەتەی قۆستەوە و باسی پێغەمبەری خوای بۆکرد و داوای لێکرد کە پێکەوە بچن بۆ لای.

دەی خۆ حەزرەتی عوسمان پێغەمبەری ناسراو بە "الأمین"ی زۆر باش دەناسی. هاوشێوەی هەموو خەڵکی، ئەویش پێغەمبەری خوای خۆشدەویست و ڕێزی لێدەگرت.

ئەم دوو هاورێیە پێکەوە چوونە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەریش بەڕوویەکی گەشەوە پێشوازی لێکردن. پاش حاڵ و ئەحواڵ پرسین، سەروەرمان دەستی کرد بە وتە شیرینەکانی:

- ئەی عوسمان، تۆ داوای ئەو بەهەشتە بکە کە خوای گەورە پەیمانی داوە. منیش وەك ڕابەرێك لەم ڕێیەدا بۆ تۆ و گشت مرۆڤایەتی نێردراوم. بزانە کە هیچ خوایەك نیە جگە لە "الله".

هەستێکی نامۆ سەرتاپای حەزرەتی عوسمانی داگرتەوە. بۆیە بەشڵەژاوی گوێی بۆ پێغەمبەرمان ڕاگرتبوو. هەر وشەیەك لە زاری پێغەمبەری خوا دەهاتە دەرەوە دڵی ئەمیشی دەهێنایە جۆش. پێغەمبەری ئازیز ﷺ بە دوور و درێژی جوانییەکانی ئیسلامی بۆ شیکردەوە. پاشان چاوی بڕیە نێو چاوانی حەزرەتی عوسمان و ئەم ئایەتەی خوێندەوە:

"ڕزق و ڕۆزیتان و ئەو شتانەش کە پەیمانتان پێدراوە هەموو لە

ئاسمانن.»

ئەم ئایەتە موچڕکەی بە گیانی حەزرەتی عوسماندا هێنا، ئیتر هەر لەوێدا ئیمانی هێنا و موسوڵمان بوو.

وەك ئەوە وابوو سەرلەنوێ لەدایك بوویێتەوە. ڕۆحی لەوێدا باڵی گرتبوو. کاتێك لای پێغەمبەری نازداری جێهێشت، واهەستی دەکرد کە دوو باڵی هەیە و بە ئاماندا دەفڕێت، نەك پێ بەزەویدا دەنێت.

* * *



# ئەشکەنجە

حەکەم کە دەکاتە مامی حەزرەتی عوسمان (ڕەزای خوای لێبێت)، هەر ئەوەندەی هەواڵی موسوڵمان بوونی برازاکەیی بیست، چوو بە دوایدا. حەکەم هەرگیز وەکو ئەو ڕۆژە توڕە نەبوو بوو. ئەوە

بوو لەکۆتاییدا دۆزییەوە. سەرەتا ویستی توڕەییەکەی بشارێتەوە. بۆیە بە شێوازێکی لەسەرخۆ وتی:

- برازای خۆشەویستم، وەکو بیستومە دەڵێن چوویتەتە سەر دینی موحەممەد ﷺ. ئایا ئەمە ڕاستە؟

حەزرەتی عوسمان (ڕەزای خوای لێبێت) هەواڵەکەی پشتڕاست کردەوە و هەموو شتێکی بۆ مامی باسکرد. حەکەم بەم هەواڵە ئەوەندە پەشۆکا بوو، لە تاوا نەیدەزانی چیبکات. بۆیە سەرەتا بە پێکەنینەوە قسەی کرد و وتی:

- سەیرکە عوسمان، خۆت دەزانیت چەندە تۆم خۆشدەوێت و هەرگیز لەگەڵ کوڕەکانمدا جیاوازیم نەکردوویت. بەڵام دەمەوێت پێت بڵێم کە ئەم کارەت تەواو زویری کردم. ئێستا چی بە خزمەکانمان بڵێین؟ چۆن ڕوومان بێت خۆمانیان پیشان بدەین؟

حەکەم تا پێی دەکرا بەشێوازێکی نەرم قسەی دەکرد. مەبەستیشی پاشگەز کردنەوەی عوسمانی برازای بوو لەم ئایینە نوێیە. بەڵام حەزرەتی عوسمان (ڕەزای خوای لێبێت) لەسەر بڕیارەکەی خۆی سوور بوو. هەر بۆیە حەکەم چەندی هێنا و برد، نەیتوانی برازاکەی پاشگەز بکاتەوە. ئیتر لە کۆتاییدا ڕووی ڕاستەقینەی خۆی دەرخست و کەوتە هاوار کردن:

- برازاکەم، من لە پێش هەموو کەسێکەوە دژی موسوڵمان بوونی تۆم. مادام بەقسەی خۆش پەشیمان نابیتەوە، ئەوا خۆم دەزانم چۆن دەتگەڕێنمەوە سەر ڕێی باپیرانمان.

حەزرەتی عوسمان مامی زۆر خۆشدەویست، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەڵێنی خۆی بەخوای هەردوو جهیانیان دابوو. بۆیە پاشگەز بوونەوە مەحاڵ بوو. پاشان بەم شێوەیە وەڵامی مامی دایەوە:

- مامەگیان سوێند بەخوای گەورە بە هیچ شێوەیەك ناگەڕێمەوە سەر ئایینی باو و باپیرانم.

حەکەم زۆر توڕە ببوو. چونکە ئەوە یەکەم جار بوو تاقە برازاکەی لە ڕوویدا بوەستێتەوە و لە قسەی دەربچێت. بۆیە ئەمەی پێ قبوڵ نەدەکرا. بەپەلە هەستا لەو ناوە دوورکەوتەوە. پاشتر دووبارە گەڕایەوە و بەهەمان شێوە برازاکەی ئاگادار کردەوە، بەڵام ئەمجارەشیان هەمان وەڵامی پێشووی وەرگرتەوە.

پاشان هات حەزرەتی عوسمانی گرت و بەتوندی بە دارێکەوە بەستیەوە. ئەوەندەش تووڕە بوو چاوەکانی سوور بووبوون. پەنجەی هەڕەشەی لێ ڕادەوەشاند و وتی:

- وازت لە ئایینێ باووباپیرانمان هێناوە و چوویتە سەر ئەم ئایینە تازەیە. ئێستاش یان دەبێت واز لەم ئایینە نوێیەت بهێنیت، یاخود ئاوا بۆخۆت بەم دارەوە دەمێنیتەوە.

هەرگیز ترس و شڵەژان نەبووبوونە میوانی حەزرەتی عوسمان. بۆیە سەیرێکی ڕووخسارە توڕەکەی مامی کرد و وتی:

- بەخوا نە واز لە دینەکەم دەهێنم، نە لە موحەممەدیش دوور دەکەومەوە.

حەکەم تەواو بەرچاوی ڕەش بوو، ئەمجارەیان توندتر هاواری

بەسەردا کردەوە و وتی:

- نان و ئاوت نادەمێ.

بەڵام هەڵسوکەوتی حەزرەتی عوسمان نەگۆڕا. حەکەم دەستی کرد بە ئەشکەنجەدانی. ئەوەبوو لە ژوورێکدا بەندی کرد و ئاگری لە ژوورەکەدا کردەوە، ئەمەش بۆ ئەوەی بە دوکەڵی ئاگرەکە بیخنکێنێت. بەڵام سەرەڕای هەموو ئەم ئازار و مەینەتییانە حەزرەتی عوسمان هێشتا هەر خۆی نەدا بە دەستەوە. دانی بەخۆدا گرت و هەوڵی دا تا دەتوانێت بەرگە بگرێت، بەڵام لەکۆتایدا ژوورەکە هەوای تێدا نەما و بووراییەوە.

حەکەم بە شڵەژاوی حەزرەتی عوسمانی لە ژوورەکە هێنایە دەرەوە. دوای ماوەیەك حەزرەتی عوسمان هاتەوە هۆش خۆی، بەڵام چاوەکانی ئەوەیان لێ دەخوێندرایەوە کە واز لەم دینە ناهێنێت. حەکەمیش نەیتوانی زیاتر بەرگە بگرێت، بۆیە وتی:

- زۆر باشە چۆنت دەوێت با وا بێت. من ئەوەی پێویست بوو بیڵێم، وتم. تۆ ئیتر سەربەستیت. ئەوە من ماڵئاوا.

* * *



# فشاری دایک

حەزرەتی عوسمان بەدڵخۆشیی موسوڵمان بوونیەوە گەڕایەوە ماڵەوە. ئەروای دایکی پێشوازی لێکرد، تەماشایەکی ڕۆڵە بەڕێزەکەی کرد و وتی:

- عوسمان.

حەزرەتی عوسمان پێشبینی کردبوو کە دایکی چی پێ دەڵێت. ئەویش هاوشێوەی حەکەمی مامی، دەیویست قایلی بکات دەست لە دینەکەی هەڵبگرێت. ئەروا ئاهێکی قوڵی هەڵکێشا و هەرچی هەست و سۆزی دایکایەتی هەبوو بەکاریهێنا و وتی:

- ئەگەر نەگەڕێیتەوە سەر ئایینی باو و باپیرانمان ئەوا سوێند دەخۆم لەم ماڵە بڕۆم و چیدی لێرە نەژیم، وە ئیتر لەژێر هەمان بنمیچدا لەگەڵتدا نەمێنمەوە. نە لەو خواردنانە دەخۆم کە تۆ دەیهێنی، نە پۆشاکەکانیشت دەپۆشم.

حەزرەتی عوسمان دایکی زۆر خۆش دەویست. بۆیە هەرگیز نەیدەویست دڵی دایکی نیگەران ببێ. بەڵام مادام ئەمجارەیان بابەتەکە ئیمان هێنان بوو بە خوا و پێغەمبەرەکەی، ئەوا نەیدەتوانی بە قسەی دایکی بکات و لە ئایینەکەی پاشگەز بێتەوە.

ئەروا لە ڕوخساری کوڕەکەیدا ئەوەی خوێندەوە کە قسەکانی کاریگەرییان نەبووە و دیارە پێیدا کە پاشگەز نابێتەوە. لەوە تێگەیشت؛ گەر لە برساندا بشمرێت، ئەوا دیسان لە ئایینەکەی خۆی پاشگەز نابێتەوە. بەڵام ویستی تۆزێکی تریش فشار بخاتە سەری و وتی:

- کوڕم، ئەوە من دەچم بۆ ماڵی براکەم و ماڵت بۆ چۆڵ دەکەم. ئەوەش بزانە کە هەتا ئەو کاتەی تۆ دەست لەم ئایینە هەڵنەگریت، ناگەڕێمەوە.

ئەروا شتومەکەکانی کۆکردەوە و چوو بۆ ماڵی براکەی. کاتێك بە کۆڵانەکاندا تێدەپەڕی هەر بیری لە ڕووخسارە خەمبارەکەی

حەزرەتی عوسمان دەکردەوە و کەمێك ئومێدی بە بەردا دەهاتەوە. دیارە خۆ کوڕەکەی کەسێکی بەبەزەیی بوو، خاوەنی کەسایەتییەکی وەها بوو کە ئازاری کەسی نەدەدا. بۆیە بە خەیاڵی خۆی دەیوت زۆری پێناچێت و پاش دوو سێ ڕۆژی تر دێت و دەڵێت: "دایە گیان، باشە تەواو، تۆ خەم مەخۆ. وا من دەگەڕێمەوە سەر ئایینی باو و باپیرانمان. بەس تۆ بگەڕێرەوە بۆماڵەوە."

حەزرەتی عوسمان (ڕەزای خوای لەسەر بێت) بە ڕۆشتنی دایکی زۆر خەمبار بوو. بەڵام هۆکاری سەرەکی خەم خواردنەکەی ئەو، بێبەش بوونی ئەو دایکە خۆشەویستەی بوو لەم ئایینە جوانە. باشە چی دەبوو گەر ئەویش بیوتایە: "ڕۆڵە گیان، ئافەرین بۆ تۆ کە موسوڵمان بوویت. موحەممەد کەسێکە گوفتار و ڕەفتاری ڕاست و دروستە. دەی منیش بەرە بۆ لای، تا منیش موسوڵمان ببم."

چەند مانگێك تێپەڕی بوو. ئەروا بێ ئەوەی کەس بزانێت، لەملا و ئەولا پرسیاری دەربارەی عوسمانی کوڕی دەکرد. دەیویست بزانێت کوڕەکەی پەشیمانە یاخود نا. هەموو ڕۆژێك لەپەنجەرەی ژوورەکەیەوە بە ئومێدەوە دەیڕوانییە دەرەوە و چاوەڕێ بوو عوسمان پەشیمان ببێتەوە و بگەڕێتەوە بۆلای. بەڵام ئەم ئومێدەی نەهاتە دی.

حەزرەتی عوسمان بە جۆرێکی وا ئیمانی بە خوای گەورە هێنابوو، کە ئەگەر دنیاشی بەسەردا بڕوخایە، ئەوا هەرگیز پەشیمان نەدەبووەوە. ئەروا لە کۆتاییدا تێگەیشت کە کوڕەکەی لە سەر بڕیارەکەی خۆی سوورە و ناگەڕێتەوە. وە هەرگیز دەست لە ئایینی

خوای گەورە هەڵناگرێت. بۆیە دووبارە گەڕایەوە ماڵی خۆیان و لای ڕۆڵە خۆشەویستەکەی بەردەوامی بە ژیانی دا.

* * *



# کۆچ

موسوڵمانان لە مەککە ئازار و ئەشکەنجەیەکی زۆر دەدران و بەردەوام لە ژێر هەڕەشە و فشاردا بوون. کاتێك لە ماڵ دەردەچوون، بەهیوای گەڕانەوە نەبوون. بێباوەڕان بەچاوی پڕ قین و نەفرەتەوە لێیان دەڕوانین. هەروەها چەندین وشەی نابەجێ و نەشیاویان بەرامبەر بەکار دەهێنان و سوکایەتییان پێ دەکردن. چەندین پلانی یەك لە یەك ترسناکتریان بۆ ئازاردانیان دادەڕشت. بەڵام هەموو ئەم کارانە جگە لە بەهێزکردنی ئیمانی موسوڵمانەکان هیچ ئاکامێکی

تری لێ نەکەوتەوە.

پێغەمبەری خوا لە نزیکەوە ئاگاداری بارودۆخی هەموو موسوڵمانان بوو. بەتایبەتی موسوڵمانە بێکەس و بێدەسەڵاتەکان. هەردەم لە نزا و پاڕانەوەدا بوو بۆیان. وە یەك بە یەك سەلامی بۆ دەناردن و داوای لێدەکردن کەمێکی تریش دان بەخۆیاندا بگرن.

ڕۆژ لەدوای ڕۆژ ئەشکەنجەدانی موسوڵمانان زیادی دەکرد. ئەوەبوو کۆمەڵێك موسوڵمان بە ڕوخسەتی پێغەمبەری خوا ﷺ بەنهێنی لە مەککەوە چوون بۆ حەبەشە. سەرەڕای سەختی بارودۆخی بیابان، دەستیان کرد بە ڕۆشتن. پاشای ئەو وڵاتە کەسێکی تێگەیشتوو و بەبەزەیی بوو.

حەزرەتی عوسمان پێشڕەوی ئەو کۆمەڵەیە بوو کە چوون بۆ حەبەشە. پێغەمبەری سەروەر ﷺ ئەم کۆمەڵە موسوڵمانەی بە حەزرەتی عوسمان سپارد.

حەزرەتی عوسمان (ڕەزای خوای لێبێت) کەسێکی زۆر دەوڵەمەند بوو. بەڵام ئەو هەمووی لە پێناو خوا و پێغەمبەرەکەیدا بەخشیبوو. روقیە خاتوونی خێزانیشی کە کچی پێغەمبەری خوا بوو، لەگەڵ خۆیدا بردی و لەگەڵ موسوڵماناندا ڕێگەی حەبەشەیان گرتە بەر و دوای ماوەیەک گەیشتنە ئەوێ.

پێغەمبەری سەردار بەدوای حەزرەتی عوسماندا فەرمووی:

- عوسمان لەدوای حەزرەتی لوطەوە یەکەم کەسە کە لەگەڵ خێزانەکەیدا کۆچ بکات. بەڕاستی ئەمە شەرەفێکی زۆر مەزن بوو

بۆ حەزرەتی عوسمان.

ئیتر بە درێژایی مانەوەیان لە حەبەشە، گوێیان بۆ هەواڵی مەککە هەڵخستبوو و چاوەڕێی هەواڵی خۆشیان دەکرد. لەم ماوەیەشدا خاتوو روقیە کوڕێکی جوانی بوو. حەزرەتی عوسمان زۆر دڵشاد بوو. کوڕەکەیان ناو نا عبداللە. عبداللە شادییەکی بێهاوتای بەخشییە ئەم دایك و باوکە غەریبە.

هەرچەندە دڵخۆش بوونایە، بەڵام هەر بیری مەککەیان دەکرد. هەموو رۆژێك کۆدەبوونەوە و باسی ئەو کاتانەیان دەکرد کە لە مەککە بەسەریان بردبوو. هەروەها زۆر بیری پێغەمبەری خوا و هاوەڵە خۆشەویستەکانیان دەکرد کە هێشتا کۆچیان نەکردبوو.

لە کۆتاییدا هەواڵێکی زۆر خۆشیان لە مەککەوە پێگەیشت. هەموو لەخۆشیاندا یەکتریان لەئامێز دەگرت و هەواڵەکەیان بە یەکتری دەگەیاند:

- هەموو خەڵکی مەککە موسوڵمان بوون.

- زۆر سوپاس بۆ خوا. تەنانەت ئەبوجەهلیش ئیمانی هێناوە.

- ئەمە هەواڵێکی چەندە خۆشە! ئیتر هیچ رێگرێك نەماوە لەبەردەم گەڕانەوەماندا.

- کەواتە دەگەڕێینەوە بۆ مەککە.

ئامادەکارییەکانی گەڕانەوەیان تەواو کرد و هەموو پێکەوە بەڕێ کەوتن. بەشادییەوە دەگەڕانەوە بۆ ئەو نیشتیمانەی کە بە چاوی پڕ فرمێسکەوە بەجێیانهێشتبوو. بەڵام کاتێك لە مەککە نزیك بوونەوە،

هەستیان بە نامۆییەك كرد. بەو شێوەیە نەبوو كە چاوەڕێیان دەكرد. لە كۆتاییشدا هەموو ڕاستییەكانیان بۆ دەركەوت. ئەبوجەهل هەر ئەو ئەبوجەهلە كەللەڕەقە بتپەرستەی جاران بوو. هەواڵەكەش هیچ بنەمایەكی ڕاستی نەبوو. ئەوەی بەرچاو بوو ئەوە بوو كە هیچ گۆڕانكارییەكی ئەوتۆ ڕووی نەدابوو.

حەزرەتی عوسمان نەیدەویست پاش ئەوەی ئەو هەموو ڕێگەیەیان بڕیبوو بەبێ بینینی پێغەمبەری خوا بگەڕێتە دواوە. چونكە زۆر بیری سەروەرمانی دەكرد. بۆیە هەواڵی نارد بۆ ناسیاوێكی لە مەككە و داوای لێكرد بیخاتە ژێر چاودێری خۆیەوە. ئەمەش بۆ ئەوە بوو كە بێباوەڕان نەتوانن زیانی پێ بگەیەنن. ناسیاوەكەشی بە داواكاریەكەی حەزرەتی عوسمانی قایل بوو و وتی: "عوسمان لەژێر چاودێری مندایە. تا من لە ژیاندا بم، كەس ناتوانێت زیانی پێبگەیەنێت."

پاشان حەزرەتی عوسمان هاتە ناو مەككەوە. بەڵام پاش ماوەیەك لەسەر داواكاری پێغەمبەری خوا كۆچی كرد بۆ مەدینە. یەكێك لە ئەنصارەكان لە ماڵەكەی خۆیدا میوانداری حەزرەتی عوسمانی كرد. حەزرەتی عوسمانیش تا خانوویەكی تازەی بۆ خۆی دروست كرد لە ماڵی ئەواندا مایەوە.



# مزگەوتە بچووکەکە

پێغەمبەری خوا ﷺ هەر کە گەیشتە شاری مەدینە، دەستبەجێ مزگەوتێکی دروست کرد. ئەم مزگەوتەی کە زەویەکەی لەلایەن حەزرەتی ئەبوبەکرەوە کڕدرابوو، لە سەرەتادا بەشی موسڵمانانی دەکرد. بەڵام پاش ئەوەی جوانییەکانی ئەم ئایینە بەهەر چوارلادا زۆر بە خێرایی بڵاو بووەوە. ئیتر ژمارەی موسوڵمانان ڕووی لە زیادبوون کرد و خەڵکی دەستە دەستە ڕوویان لە مەدینە دەکرد. بۆیە چیدی وەکو جاران مزگەوتەکە جێی هەمووانی تێدا نەدەبووەوە.

پاشان ڕۆژێکیان پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ چاوێکی بەناو مزگەوتەکەدا گێڕا و فەرمووی:



- کێ مزگەوتەکەمان فراوان بکات، ئەوا خوای گەورە دەیخاتە بەهەشتەکەی خۆیەوە.

حەزرەتی عوسمان (ڕەزای خوای لێبێت) هەر کە گوێی لەم فەرمایشتەی سەروەرمان بوو یەکسەر هەستایە سەر پێ و

فەرمووی:

- دایك و باوكم بەقوربانت بن ئەی پێغەمبەری خوا. ڕێگەم پێ بدە با من مزگەوتەکە فراوان بکەم.

ئیتر دوای ئەوەی پێغەمبەری خوا ڕەزامەندی لەسەر نیشاندا، حەزرەتی عوسمان خێرا دەستی کرد بە کارکردن بۆ فراوانکردنی مزگەوتەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ.

پاشان وەک هەنگاوی یەکەم هەستا بە کڕینی هەموو ڕووبەری چواردەوری مزگەوتەکە. کارە بیناسازییەکانیش لە ماوەیەکی کەمدا تەواو کران. پاش تەواوبوونی کارەکان، مزگەوتەکە زۆر لە جاران فراوانتر بوو. وە هەموو موسوڵمانان بەمە دڵخۆش بوون.

پێغەمبەری خواش ﷺ بە بینینی ئەمە زۆر دڵخۆش بوو و دوعای بۆ حەزرەتی عوسمان کرد.

زۆری پێنەچوو لەپای ئەم خۆبەخشییانەی حەزرەتی عوسمانەوە، ئایەتی هەژدەی سوورەتی تەوبە دابەزی:

"بێگومان ئەو کەسانەی ماڵی خودا ئاوەدان دەکەنەوە، ئەو کەسانەن کە باوەڕیان بە ڕۆژی دوایی هێناوە و بەدڵ بێدارییەوە نوێژەکانیان دەکەن و زەکاتی ماڵ و سامانیان دەردەکەن، وە لە خودایش زیاتر لە کەسێکی تر ناترسن."

* * *



# بیری ڕومه

کەشی مەدینە گەرم بوو. خەڵکیش سەرقاڵی باخ و بێستانەکانیان بوون. ئەوانەی لەژێر ئەو خۆرە بەتینەدا پاچیان دەوەشاند و میوەیان کۆدەکردەوە، لە کاتی پشوودانیدا یەکسەر پرپیان دەدایە گۆزە ئاوەکانیان و تینوێتی خۆیان دەشکاند. ئیتر ئاوی فێنکی بەر سێبەر، جارێکی تر ژیانی بەلێوە وشک هەڵاتووەکان دەبەخشیەوە. جا لەبەر ئەوەی ئاوی

مەدینە شیرین نەبوو ئەوا تەنها تیونێتی کەسانی زۆر تینووی دەشکاند. تەنها یەك بیریش هەبوو کە خەڵکی تامیان لە ئاوەکەی وەردەگرت، ئەویش لە دەرەوەی مەدینە بوو.

بێگومان تەنیا کێشەی ئەم بیرە ئەوە نەبوو کە لە دەرەوەی مەدینە بوو. بەڵکو کێشەی سەرەکی ئەم بیرە ئەوەبوو کە هی کابرایەکی یەهودیی بێ ویژدان بوو. قفڵێکی گەورەی لە دەمی بیرەکە دابوو. ئەوەی بیویستایە ئاوی شیرین بخواتەوە دەبوایە لە پێشدا پارە بەم کابرا یەهودییە بدات، ئینجا دەیتوانی بچێت گۆزەکەی پڕئاو بکات.

بەڵام خەڵکانێکی زۆر هەبوون کە پارەیان نەبوو. هەر بۆیەش ناچاربوون لە ئاوەکەی تر بخۆنەوە. هەندێك جار ئەم خەڵکە هەژارانە گۆزەکانیان دەبرد و دەچوونە سەر بیرەکە. کابرای چرووکیش پێی دەوتن:

- پارەتان پێیە، پارە؟

بەڵام کاتێك هەژاری بەستەزمان دەیوت:

- پارەم پێ نیە. بەڵام گەر پەیامکرد بۆت دەهێنم.

کابرای یەهوی دەموچاوی دەدا بە یەکدا و دەینەڕاند:

- نابێت خاڵۆ. ئەوەتا ڕۆژ بە ڕۆژ ئاوی بیرەکەم کەم دەکات. خۆ ئەم ماوەیەش هەر باران نابارێت. ئەی باشە گەر هەر یەکێك هات و من بە بەلاش ئاوی بدەمێ، خۆ لەبرسا دەمرم. ئەی من بەچی بژیم؟ دەی، کە پارەتان بوو ئینجا وەرنەوە.

هەڵسوکەوتی ئەم کابرایە ببووە جێی بێزاری خەڵکی مەدینە. ڕۆژێکیان پێغەمبەری خودا ﷺ لەگەڵ هاوەڵەکانیدا گفتوگۆی دەکرد. باس هات و ڕۆیشت تا لە کۆتاییدا هاتنە سەر بابەتی بیری ڕوممە و باسی ڕەفتاری ئەم کابرایەیان بۆ پێغەمبەری خوا گێڕایەوە. سەروەریشمان بە بیستنی ئەمانە گەلێک ناڕەحەت بوو. بۆیە سەیرێکی دەوروبەری کرد و باسی پێویستیی کڕینەوەی بیری ڕوممەی کرد:

- هەر کەسێک ئەم بیری ڕوممەیە بکڕێت و بیخاتە خزمەتی موسوڵمانانەوە، ئەوا بەهەشت چاوەڕێیەتی.

حەزرەتی عوسمان (ڕەزای خوای لێبێت) یەکسەر چووە لای کابرای یەهودی و پێی ڕاگەیاند کە بۆ کڕینی بیرەکە هاتووە. کابرا هیچ گرنگییەکی بەم داواکارییە نەدا. بەڵام بۆ جاری دووەم حەزرەتی عوسمان نرخێکی خەیاڵی خستە بەردەم کابرا و ئەویش قبووڵی کرد. بۆیە بە زەردەخەنەوە وتی:

- باشە، ئەوە لەبەر خاتری تۆ نیوەیت پێدەفرۆشم. بۆ خۆت ئاوەکەی بە خەڵکی بفرۆشە و پارەی پێ پەیدا بکە. منیش لە نیوەکەی خۆمەوە لە ئاو فرۆشتن بەردەوام دەبم.

بەم شێوەیە بیری ڕوممە ڕۆژێك لەدەستی حەزرەتی عوسمان و ڕۆژی دواتریش لەدەستی کابرای یەهودیدا بوو. کابرای یەهودی لە نۆرەی خۆیدا وەك جاران بەردەوام بوو لە فرۆشتنی ئاو بە نرخەکەی جارانی، بەڵام حەزرەتی عوسمان لە ڕۆژی خۆیدا بە خۆڕایی دەیدایە خەڵك. هەموان بەم کارە زۆر دڵخۆش بوون. تەنانەت

ئەو یەهودییانەش کە پێشتر بە پارە ئاویان دەکڕی، سوپاسی ئەم هەڵوێستەی حەزرەتی عوسمانیان کرد و ئەوانیش لە ڕۆژی حەزرەتی عوسماندا دەهاتن بۆ ئاو بردن.

پاش ماوەیەکی کەم، کابرای یەهودی زۆر لەم کارەی پەشیمان بووەوە. لەبەر ئەوەی لە ڕۆژەکەی ئەودا خەڵك نەك نەدەهاتن بۆ ئاو کڕین، بەڵکو هەر بەلاشیدا تێنەدەپەڕین.

ڕۆژێکیان کابرای یەهودی کە چاوەڕوان بوو خەڵك بێن ئاو بکڕن، وتی: "سەیری ئەم حاڵەی تێیکەوتوم! ئەو ڕۆژەی سەرەی منە نە مرۆڤ دێت نە ئاژەڵ. جاران کە مەڕوماڵات لەم ناوەوە تێدەپەڕین و تینویان دەبوو، دەهاتنە سەر بیرەکەی من، ئەی ئێستا لەکوێن، بۆ نایەن؟ تەنانەت مێشێکیش چییە، لێرەوە تێناپەڕێت. خوا نەکات سبەینێش وابێت. ئەم ناوە پڕ دەبێت لە خەڵك، چونکە ئاو بەخۆڕاییە. ئای بێئەقڵ خۆم! لە کاتێکدا کارەکانم هەمووی بەڕێکوپێکی بەڕێوە دەچوون، چۆن عوسمانم کرد بە هاوبەشی خۆم! ئیش و کاری ئەویش لەم ژیانەدا تەنها بەخشینە. هەرچی دەستدەکەوێت بەخۆڕایی دەیدات بە خەڵك. تازە تەواو، من تەواو! هەر هیچ نەبێت بچم بەشەکەی خۆشمی پێبفرۆشم."

بۆیە یەکسەر هەستا و ڕای کرد بۆ مەدینە. حەزرەتی عوسمانی دۆزییەوە و پێی وت:

- بیرم کردەوە و بڕیارم دا کە نیوەکەی تری بیرەکەشت بە هەمان نرخی نیوەکەی تر پێبفرۆشم؟

حەزرەتی عوسمان بەشەکەی تری بیرەکەشی لێکڕییەوە. ئیتر لەو

ڕۆژە بەدواوە بیرەکە هەموو ڕۆژێك لەخزمەتی موسوڵمانانندا بوو. خەڵکیش لەگەڵ هەر ئاو بردنێکدا دوعای خێریان بۆ حەزرەتی عوسمان دەکرد.

* * *



# زرێ بۆ فرۆشتن

حەزرەتی عوسمان لە بازاڕدا دەگەڕا. گوێی لە دەنگی دەڵاڵێکی شتومەک بوو هاواری دەکرد:

- زرێمان لایە بۆ فرۆشتن. وەرنەوە زرێی چاکمان لایە!

لە کاتێکدا خەڵکی لە دەوری زرێکە کۆ بووبوونەوە، حەزرەتی عوسمانیش لەوێوە تێپەڕی. دوو کەس لەوانەی لەوێ بوون خەریک بوون لەگەڵ دەلاڵەکەدا مامەڵەیان دەکرد. بۆیە ئەمیش چووە پێشیانەوە و بە تاسەوە پرسی:

- ئەمە زرێکەی عەلی نییە.

- با، زرێکەی ئەوە...

- بۆچی دەیفرۆشێت؟

- چونکە فاتیمە خاتوون دەگوازێتەوە. دەیەوێت بەپارەی ئەم زرێیە تێچوونی ڕێوڕەسمەکە دابین بکات.

حەزرەتی عوسمان لە دڵی خۆیدا بیری کردەوە: "زرێیەکی ئاوا تۆکمە، هەر لە پاڵەوانێکی وەك حەزرەتی عەلی دێت."

بۆیە پرسی:

- بەچەند دەیفرۆشیت؟

- بە چوارسەد...

- ئەمە بدە بە من، تا ماڵەوەش وەرە لەگەڵم با پارەکەت بدەمێ.

حەزرەتی عوسمان (ڕەزای خوای لێبێت) لەگەڵ دەلاڵەکەدا کەوتنە ڕێ. کە گەیشتنە ماڵ، حەزرەتی عوسمان پارەی زرێکەی پێدا، پاشان هێندەی نرخی زرێکەش پارەی لەناو زرێکەدا دانا و فەرمووی:

- ئەمە بەرە و بیدە بە عەلی! سەلامی منی پێبگەیەنە و پێی

بڵێ ئەم زرێیە تەنها لەو دێت. ئەو پارەیەش کە تێیدایە با بۆ ڕێوڕەسمی گواستنەوەکە بەکاری بهێنێت.

* * *

# دیاری

لەناو سوپای موسوڵمانانندا کێشەی کەمیی خۆراك سەری هەڵدابوو. بۆیە هەموان لە بارێکی پەشێویدا بوون. تەنانەت وای لێهاتبوو هەندێکیان بۆ نەهێشتنی برسێتی، ماوەیەکی زۆر ناوکە خورمایان لەناو دەمیاندا دەهێنا و دەبرد.

جەنگاوەران زۆر برسیان بوو. تەنانەت لەو کاتانەدا پارچە نانێکی وشك بە خواردنێکی زۆر بەتام و بەلەزەت دادەنرا. بۆیە دەهاتن بەردیان لەسەر سکیان دەبەست و بەو شێوەیە ئارامیان دەگرت. هیچ کەسیش بێزاری دەرنەدەبڕی بەرامبەر بەم بارودۆخە. لەبەر ئەوەی پێغەمبەری خواش لە هەمان حاڵدا بوو لەگەڵیاندا.

چەند دووڕوویەکیش لەناو سوپاکەدا بوون. ئەمانە کەسانێك بوون سەرەڕای ئەوەی کە موسوڵمانیش نەبوون، کەچی خۆیان

وەك موسوڵمان پیشان دەدا. کاتێک برسێتی و حاڵی پەرێشانی پێغەمبەری خوا و هاوەڵانیان دەبینی، لەناخی خۆیانەوە هەستیان بە دڵخۆشی دەکرد.

حەزرەتی عوسمان (ڕەزای خوای لێبێت) بە خەفەتەوە تەماشای حاڵی پەرێشانی هاوەڵانی دەکرد. لەو کاتەدا کە بیری لە ڕێگەچارەیەك دەکردەوە بۆ نەهێشتنی ئەم کێشەیە، گوێی لە دەنگی سەروەرمان بوو کە فەرمووی:

- سوێند بێت، خوای گەورە پێش خۆر ئاوابوون خواردنتان بۆ دەنێرێت.

حەزرەتی عوسمان و ئەوانەی لەوێ بوون بەم هەواڵە ڕوویان شاد بووەوە. ئەو بێتاقەتییەی لە ڕوخساریاندا بوو، شوێنی خۆی بۆ زەردەخەنە چۆڵ کرد. بۆیە بە ئومێدەوە کەوتنە چاوەڕێکردن.

خۆر هێواش هێواش لە ئاسۆوە ون دەبوو. چەند کاژێرێك تێپەڕی. بەڵام نە خواردن دیاربوو، نە هەواڵی. دووڕووەکان خەریك بوو دەگەشانەوە. لە ناو خۆیاندا بە چپەچپ باسی بابەتەکەیان دەکرد و دڵشادیی خۆیان دەردەبڕی:

- ئەم جارەیان بەو شێوەیە نابێت کە چاوەڕێیان دەکرد. بۆ خۆیان بە برسێتی سەر دەنێنەوە.

- ڕاست دەکەیت، تۆ سەیریان کە. چۆن باوەڕ بە قسەکانی دەکەن. بەڵام قوڕ بە سەریان. وا خۆر ئاوا دەبێت...

موسوڵمانان بە تەواوی دڵ و گیان و بیریانەوە باوەڕیان بەقسەکەی



پێغەمبەری خوا ﷺ بوو. لەڕووخسارياندا هيچ شوێنەوارێکی دوودڵی نەدەبینرا.

یەکێك لەناویانەوە هاواری کرد:

- ئەی خەڵکینە! سەیری ئەولاوە بکەن! ئەو هەموو وشترە بە باری ئازووقەوە بەرەو ئێرە دێن.

هەموویان هەستانە سەرپێ و لەخۆشیدا دەستیان کرد بە هاوار:

- سەد شوکور بۆ تۆ خوایە! خۆ بەڕاستی هەموو پڕن لە ئازووقە.

ئیتر بە ڕاکردن بەرەو لای وشترەکان چوون.

کاروانەکە بەردەوام بوو لە ڕۆیشتن تا گەیشتنە لای پێغەمبەری خوا، ئینجا ڕاوەستان. پێغەمبەری نازدار پرسی:

- ئەمانە چین؟

ئەو پیاوەی ئەم کاروانەی هێنابوو، بە زەردەخەنەوە وتی:

- ئەمانە دیاری عوسمانن بۆ جەنابتان.

پێغەمبەری خوا ﷺ چاوێکی بە وشترەکان و بارەکانی سەر پشتیاندا گێڕا. دڵشادی لە ڕوویدا دەخوێنرایەوە. دەستەکانی بۆ ئاسمان بەرز کردەوە و چەند جارێك دوعای کرد:

- خوایە گیان بە عوسمان ببەخشە. خوایە گیان بە عوسمان ببەخشە.

دووڕووەکان نەیاندەزانی لە بەرامبەر ئەم دۆخەدا چی بڵێن.

حەزرەتی عوسمان (ڕەزای خوای لێبێت) بێ کات بەفیڕۆدان چووبوو بەپەلە چەند وشترێکی بە بارەوە کڕیبوو و ناردبوونی. بەم کارەی، خێرێکی بۆ خۆی دەست خست کە تا ئەو ڕۆژە کەس ئەوەندەی ئەو دوعای خێری بۆ نەکرابوو.

* * *



# خۆزگە پێ خواستن

پیاوێك هەبوو زۆر هەژار بوو. ئەم هەژارییەشی زۆر ناڕەحەتی کردبوو. بەڵام هۆکاری سەرەکی ئەم ناڕەحەتییەی ئەوە بوو کە پارەی نەبوو لە ڕێگەی خوادا بیبەخشێت. بۆیە زۆر حەزی دەکرد پارەی هەبێت و بەو پارەیە خواردن و جل و بەرگ بۆ هەژاران بکڕێت و

پاداشتێکی زۆر دەست خۆی بخات.

پیاوەکە بە بەخشندەیی حەزرەتی عوسمان زۆر سەرسام بوو و دەیوت: ''خۆزگە منیش وەك ئەو بوومایە.''

ڕۆژێکیان ئەم پیاوە لە مزگەوت چاوەڕێی نوێژی دەکرد. لەوێ حەزرەتی عوسمانی بینی. یەکسەر خۆی لێ نزیك کردەوە و وتی:

- خۆزگەم بەخۆت. ئەوەندە دەوڵەمەندیت، دەتوانیت بۆ خۆت خێری پێبکەیت. کۆیلە دەکڕیت و پاشان ئازادیان دەکەیت. هەر کاتێکیش بتەوێت دەچیت بۆ حەج.

حەزرەتی عوسمان بەچاوی پڕ شەفەقەتەوە سەیرێکی کابرای کرد و پرسی:

- خۆزگەمان پێ دەخوازیت؟

پیاوەکە هەناسەیەکی قوڵی هەڵمژی و سەری بادا و وتی:

- بەڵێ، زۆریش. خێری زۆرت دەست دەکەوێت.

حەزرەتی عوسمان زەردەخەنەیەکی کرد و فەرمووی:

- خەفەت مەخۆ. سوێند بە خوا، ئەو پارە کەمەی کە هەژارێك هەوڵ دەدات پەیدای بکات و لە ڕێگەی خوادا بیبەخشێت، لە خێری دەوڵەمەندێك لەپێشترە. لەبەر ئەوەی دەوڵەمەند لە پارەیەکی زۆر کەمێك دەبەخشێت. بەڵام هەژار هەرچی هەیە دەیبەخشێت.

پاش بیستنی ئەم وتانە، پیرەمێرد بەشادمانی ئەو ناوەی بەجێهێشت.

* * *

# گەردن ئازادی

یەکێك لە خزمەتکارەکانی ماڵی حەزرەتی عوسمان هەڵەیەکی گەورەی ئەنجام دابوو. حەزرەتی عوسمانیش کە ئەمەی بینی، بە تووڕەییەوە بانگی کردە لای خۆی و گوێی گرت و سزای دا.

پاش تێپەڕبوونی ماوەیەکی زۆر بەسەر ئەم ڕووداوەدا. حەزرەتی عوسمان ڕۆژێك بە خزمەتکارەکەی فەرموو:

- ڕۆڵە ئا تا ئێرە وەرە.

خزمەتکارەکە بە ترس و لەرزەوە هاتە پێش.

حەزرەتی عوسمان فەرمووی:

- بیرتە کاتی خۆی گوێم ڕاکێشایت؟

خزمەتکارەکە لەم پرسیارەی حەزرەتی عوسمان تەواو سەری سوڕما. وەڵامی دایەوە:

- بەڵێ بیرم دێت.

حەزرەتی عوسمان سەری دانەواند و فەرمووی:

- دەی کەواتە ئێستا کاتی تۆڵەکردنەوەیە. تۆش گوێی من ڕاکێشە.

خزمەتکارەکە زۆر شڵەژابوو و نەیدەزانی چی بڵێت. حەزرەتی عوسمان دووبارەی کردەوە:

- دەی کوڕم حەقی خۆتم لێبکەرەوە.

- بەڵام گەورەم...

- نارەزایی دەرمەبڕە، چیت پێدەڵێم وا بکە. ئەگەر لەم دنیا مافی خۆت وەرنەگریت ئەوا لەو دنیا باری من قورس دەکەیت. دەی ئێستا گوێم ڕاکێشە!

خزمەتکارەکە بە لەرزە لەرز دەستی برد بۆ گوێی گەورەکەی. گوێی حەزرەتی عوسمانی خستە نێوان دوو پەنجەیەوە و زۆر بەهێواشی کەمێك ڕایکێشا. حەزرەتی عوسمان فەرمووی:

- توندتر ڕایکێشە.

ئەم جارە خزمەتکارەکە بەتەواوی دەلەرزی، بەڵام هەندێك توندتر گوێی حەزرەتی عوسمانی ڕاکێشا. پاشان گەردنی ئازاد کرد.

بەم شێوەیە حەزرەتی عوسمان لەو بابەتە ڕزگاری بوو کە دڵی توند کردبوو. ئەویش هەستکردنی بوو بە ئازاردانی یەکێک لەوانەی کە لەلای کاریان دەکرد.

* * *

# نموونەی باڵای ئابڕوو

حەزرەتی عوسمان (ڕەزای خوای لێبێت) بەهۆی شەرمنییەکەیەوە، نموونەیەك بوو هەموان دەیانویست چاوی لێبکەن. هەموو کەس باسی ئەم ڕەوشتە ناوازەیەی ئەوی دەکرد. پێغەمبەری خوا ﷺ لە بارەی

حەزرەتی عوسمانەوە فەرمووبووی: "لەناو هاوەڵەکانمدا لەڕووی خوو ڕەوشتەوە لەهەموویان زۆرتر لەمن دەچێت."

حەزرەتی عوسمان (ڕەزای خوای لێبێت) هەڵسوکەوتی لە دەرەوە لەگەڵ خەڵکیدا چۆن بووایە، لە ماڵەوەش هەر بەو شێوەیە مامەڵەی دەکرد. تەنانەت لەڕۆژە گەرمەکانی هاوینیشدا کە بۆ خۆفێنك کردنەوە ئاوی بەخۆیدا دەکرد، هەر پارچەیەك جلی لەبەر خۆیدا دەهێشتەوە.

ئەم نموونە باڵایەی شەرم و ئابڕوو ڕۆژێکیان بەمەبەستی سەردانکردنی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ماڵ دەرچوو.

لەم کاتەشدا سەروەرمان لە ماڵەوە دانیشتبوو. جلەکانی تا سەر ئەژنۆی هاتبوو، دایە عائیشەشمان لە پەنایدا بوو. لەدەرگا درا و حەزرەتی ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێت) داوای مۆڵەتی کرد بێتە ژوورەوە. پێغەمبەری خوا ﷺ هیچ خۆی تێك نەدا و ڕێگەی بە نزیکترین هاوڕێی دا بێتە ژوورەوە.

پاش ماوەیەك دووبارە لەدەرگا درایەوە. میوانی ئەم جارەیان حەزرەتی عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) بوو. ئەویش هاتە ژوورەوە و لای پێغەمبەرمان دانیشت. دووبارە پێغەمبەری نازدار ﷺ هەر خۆی تێك نەدا. ئەم سێ هاوڕێیە کەوتنە گفتوگۆ کردن.

بۆ جاری سێیەم لەدەرگا درا. حەزرەتی عوسمان داوای مۆڵەتی هاتنە ژوورەوەی کرد. بەڵام جیاواز لە جارەکانی تر پێغەمبەری سەروەر ﷺ خۆی ڕێك کردەوە و کراسەکەشی کە تا ئەژنۆی هاتبوو دای دایەوە.

پاشان حەزرەتی عوسمانیش هات بۆ لایان. ئەم چوار هاورێ گیانی بەگیانییە کەوتنە گفتوگۆکردن. پاشان یەکە یەکە ماڵی پێغەمبەری خوایان جێهێشت و ڕۆیشتن. لە کۆتاییدا تەنها پێغەمبەری خواو و دایکمان حەزرەتی عائیشە مانەوە. حەزرەتی عائیشە (ڕەزای خوای لێبێت) دەیویست هۆکاری ئەو بابەتە بزانێت، بۆیە پرسی:

- ئەی پێغەمبەری خوا کاتێک باوکم و عومەر هاتنە ژوورەوە، تۆ هیچ خۆت تێك نەدا. بەڵام کە عوسمان هاتە ژوورەوە خۆت ڕێك کردەوە و قاچەکانت داپۆشی. هۆی ئەمە چییە؟

سەرداری مرۆڤایەتی بەم وتە مەزنانە وەڵامی دایەوە:

- ئەی عائیشە، سوێند بەخوا فریشتەکانیش شەرم لە عوسمان دەکەن. ئەگەر وابێت من چۆن شەرمی لێناکەم؟ عوسمان کەسێکی زۆر شەرمنە، منی بەم شێوەیە ببینیایە، ئەگەری ئەوە هەبوو کە نەهاتایەتە ژوورەوە، هەر بۆیە منیش قاچەکانم داپۆشی.

دواتر پێغەمبەری خوا ﷺ بەم وشە بەپێزانە وەسفی حەزرەتی عوسمانی زاوای کرد:

- عوسمان بەڕەوشتترین کەسی ئوممەتەکەمە.



# مژدەی بەهەشتی پێبدەن

پێغەمبەری خوا ﷺ چووە ناو باخێکی نزیك مەدینە و لەگوێی کانییەك بۆ حەوانەوە دانیشت. لەدەرگای باخەکەدا، هاوەڵێك بێئەوەی چاوی لەسەر پێغەمبەری خوا لابدات چاوەڕێی ئەوی دەکرد.

پاش ماوەیەك لەدەرگا درا. حەزرەتی عوسمان بوو. دەیویست بێتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ. ئەو هاوەڵەی چاودێری باخەکەی دەکرد هاتە لای پێغەمبەری خوا تاکو هەواڵی هاتنی حەزرەتی عوسمان بگەیەنێت. پێغەمبەری خواش بە وتەیەکی لێوان لێو لە خۆشەویستییەوە فەرمووی:



- دەرگاکەی لێ بکەرەوە، پێشی بڵێ بەم نزیکانە تووشی چەرمەسەرییەک دەبێت. دوابەدوای ئەوەش مژدەی بەهەشتی پێبدە.

هاوەڵەکە بەڕاکردن گەڕایەوە بۆلای حەزرەتی عوسمان و دەرگای باخەکەی بۆ ئاوەڵا کرد. هێشتا حەزرەتی عوسمان یەکەم هەنگاوی

نەنابووە ژوورەوە، کە هاوەڵەکە پێی وت:

- ئەی عوسمان، پێغەمبەری خوا ﷺ ویستی هەواڵی ئەوەت پێبدەم کە بەم نزیکانە تووشی چەرمەسەرییەک دەبیت.

حەزرەتی عوسمان سەری داخست و فەرمووی:

- هەر تەنها خوای گەورە شایانی ئەوەیە داوای کۆمەکی لێبکەین.

بەڵام جارێکی تر هاوەڵەکە پێی وت:

- ئەی عوسمان، پێغەمبەری خوا مژدەی بەهەشتی دایتێ.

حەزرەتی عوسمان (ڕەزای خوای لێبێت) زۆر بەم مژدەیە گەشایەوە و دڵخۆش بوو. پڕ بەدڵ سوپاسی خوای کرد. ئینجا چووەتە خزمەت پێغەمبەری خوا. حەزرەتی ئەبوبەکر و حەزرەتی عومەریش (ڕەزای خوایان لێبێت) لەوێ بوون. هەموویان قاچیان خستبووە ناو ئاوەکەوە. حەزرەتی عوسمانیش (ڕەزای خوای لێبێت) چووە لایان، قاچی هەڵکرد و خستیە ناو ئاوەکەوە. ئینجا وەك خووی هەمیشەییان دەستیان کردەوە بە گفتوگۆ شیرینەکانی خۆیان.

* * *

# لەشکری سەخت

موسوڵمانان سەرقاڵی ئامادەکردنی لەشکرێك بوون بۆ ڕووبەڕووبونەوەی بێزەنتییەکان. ئەم لەشکرەش ناو نرا لەشکری سەخت. پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی هەموو هاوەڵانی کرد تا کۆمەك بەم سوپایە ببەخشن. بەڵام ڕۆژگارەکەی ڕۆژگارێکی سەخت بوو وە گوزەرانی خەڵکیش لە حاڵێکی پەرێشاندا بوو. خەڵکانێکی زۆر برسی بوون و هیچیان نەبوو بۆ خۆیان بیخۆن چ جای ئەوەی کۆمەک پێشکەش بکەن. هەر بۆیە بەشی هەرە گەورەی ئامادەکردنی سوپاکە لەسەر دەوڵەمەندەکان دەوەستایەوە.

بۆیە پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ فەرمووی:

- له پاشه ڕۆژدا بەهەشت مەنزڵی ئەو کەسە دەبێت کە کۆمەکی لەشکری سەخت دەکات.

حەزرەتی عوسمان (ڕەزای خوای لێبێت) هەستایە سەرپێ و فەرمووی:

- سەد وشتر بەبارەوە لەسەر من.

پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر بەم قسەیە دڵخۆش بوو. بەڵام خۆ دیاربوو کە ئەم کۆمەکە بەس نەبوو بۆ پڕکردنەوەی پێداویستییەکانی لەشکری سەخت. بۆیە جارێکی تریش داوای کۆمەکی لە هاوەڵان کردەوە بۆ لەشکری سەخت.

حەزرەتی عوسمان دووبارە فەرمووی:

- سەد وشتری تر بەبارەوە لەسەر من.

پێغەمبەری ئازیز ﷺ بەم قسەیە ئەوەندەی تر ڕووی گەشی کرایەوە. ئەمجارەیان کە دیسانەوە هانی هاوەڵانی دایەوە بۆ کۆمەکی کردن، حەزرەتی عوسمان ئەمجارەش فەرمووی:

- سەد حوشتری تریش بەبارەوە دەبەخشم بە لەشکری سەخت.

پێغەمبەری سەروەر ﷺ بە تاسەوە دەستی بەرز کردەوە و فەرمووی:

- لەمەودوا عوسمان هەرچی بکات، لێپرسینەوەی لەگەڵدا ناکرێت.

حەزرەتی عوسمان بەپەلە و بێ دواکەوتن کەوتە کار بۆ کۆکردنەوەی

کۆمەك بۆ لەشکرەکە. بە ڕاست و چەپدا ڕای دەکرد و هەوڵی دەدا لە کەمترین ماوەدا پێویستییەکان کۆبکاتەوە. پێغەمبەری خوا بە بینینی ئەم تاسەمەندییەی حەزرەتی عوسمان، ئەم نزایەی بۆ کرد:

- خوایەگیان لەو کارانەی کردوویەتی و دەیکات، لە کارە پەنهان و ئاشکاراکانی، لەو کارانەی شاردوویەتیەوە و یاخود دەری بڕیوە، لە هەموو کارێکی عوسمان خۆش ببە.

حەزرەتی عوسمان (ڕەزای خوای لێبێت) سەدان دیناری ئاڵتونی هێنا و خستیە بەردەم پێغەمبەری خوا ﷺ. پێغەمبەریش دەستی خستە ناو ئاڵتونەکان و بەچاوی پڕ فرمێسکەوە فەرمووی:

- خودایە من لە عوسمان ڕازیم، تۆش لێی ڕازی بە.

* * *

# لەرزینی چیای ئوحود

ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا ﷺ و هەر سێ هاوەڵی بەڕێز، حەزرەتی ئەبوبەکر و حەزرەتی عومەر و حەزرەتی عوسمان (ڕەزای خوایان لێبێت) پێکەوە چوونە سەر کێوی ئوحود. لەو کاتەدا کە بە دیمەنەکانی دەوروبەریاندا دەیانڕوانی، لەناکاو کێوەکە دەستی بە لەرزین کرد. بەم هۆیەشەوە هەندێک بەردی سەر کێوەکە تلۆر

بوونەوە.

سەروەرمان تەماشایەکی هاوەڵانی کرد، پاشان ڕووی کردە کێوەکە و بە ئاوازێکی بەسۆزەوە فەرمووی:

- ئەی ئوحود ئارام بەرەوە، وا ئێستا پێغەمبەرێك و ڕاستگۆیەك و دوو شەهید لەسەرت ڕاوەستاون.

دوای ئەم قسانە شاخەکە لە لەرزین کەوت.

حەزرەتی عومەر و عوسمان دەیانزانی کە نازناوی ڕاستگۆ نازناوی حەزرەتی ئەبوبەکرە، پێغەمبەریش مەبەستی خۆی بوو. بۆیە ئەو شەهیدانەی کە پێغەمبەری خوا باسی کردن مەبەستی ئەوان بوو. بەم شێوەیە پێغەمبەری نازدارمان ئاماژەی ئەوەی پێدان کە ڕۆژێك دێت، شەهید دەبن.

لە کۆتایدا وتەکانی پێغەمبەری خوا وەکو خۆیان هاتنەدی و ئەم دوو هاوەڵە بەڕێزەش بە شەهیدی گیانیان سپارد و بەرەو لای خوای گەورە و دلۆڤان گەڕانەوە.

* * *



# نوێنەر

مەککە لەدەستی بێباوەڕاندا بوو. هەر بۆیە موسوڵمانان نەیاندەتوانی بەئاسانی سەردانی کەعبە بکەن. پێغەمبەری خواش دەیویست لەگەڵ هاوەڵاندا سەردانی کەعبە بکات. ئەوەبوو بڕیاردرا و نزیکەی هەزار و پێنج سەد کەس کەوتنە ڕێ. جگە لە شمشێری سەفەر، کەس هیچ جۆرە چەکێکی تری لەگەڵ خۆیدا نەهێنابوو. مەبەستی ئەم کارەشیان پیشاندانی ئەوە بوو کە ئەمان بۆ تەواف هاتوون نەوەك بۆ شەڕ. موسوڵمانان بە پۆشاکی ئیحرامەوە لەدووری

ڕۆژەڕێیەك لە مەككەوە بار و كۆچیان خست و وشترەكانیان مۆڵدا.

كاتێک هەواڵ گەیشتە مەككە. بێباوەڕان بەپرتاو كۆبوونەوە، هەر لەوێشدا بڕیاریاندا بەهیچ شێوەیەک ڕێ بەهاتنە ناوەوەی موسوڵمانان نەدەن بۆ مەككە. ئەمەش سەرباری ئەو هەموو نیەت پاكییەی كە پێغەمبەری خوا پیشانی دا، بەڵام ئەوان لە بڕیارەكەی خۆیان پاشگەز نەبوونەوە.

بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ بڕیاریدا نوێنەرێك بنێرێت بۆ مەككە تا بێباوەڕان تێبگەیەنێت كە ئەمان تەنها بەمەبەستی تەواف هاتوون و نییەتی شەڕیان نییە.

لەكۆتاییشدا بڕیار لەسەر حەزرەتی عوسمان درا كە وەك نوێنەر بنێردرێت. لەبەر ئەوەی حەزرەتی عوسمان (ڕەزای خوای لێبێت) لەناو شاردا خزمی زۆربوو، بۆیە كەس بیری لەوە نەدەكردەوە هیچ زیانێكی پێبگات. حەزرەتی عوسمان پاش ئەم بڕیارە كەوتە ڕێ.

بە ڕۆیشتنی حەزرەتی عوسمان، هەموو موسوڵمانان بەتاسەوە لە چاوەڕوانی گەیشتنی هەواڵی دڵخۆشكەردا بوون. دەبوو بێباوەڕان چ وەڵامێك بدەنەوە؟ جا تۆ بڵێی حەزرەتی عوسمان بتوانێت قایلیان بكات؟ یەكێك لەهاوەڵان فەرمووی:

- گەر ڕێگە بە ئێمەش نەدەن، هیچ نەبێت عوسمان دەتوانێت تەوافی كەعبە بكات.

پێغەمبەری سەروەر ﷺ ڕووی كردە هاوەڵەكەی و فەرمووی:

- عوسمان بێ من تەواف ناكات.

هەر کە حەزرەتی عوسمان (ڕەزای خوای لێبێت) چووە ناو شارەکەوە، یەکسەر بێباوەڕان خستیانە ژێر چاودێریەوە. سەرەڕای ئەوەی هەموو قسەکانی پێغەمبەری خواشی پێ ڕاگەیاندن بەڵام هیچ گوێیان لێنەگرت. کە حەزرەتی عوسمان فەرمووی: "تەنها تەواف دەکەن و دەگەڕێنەوە مەدینە." ئەوان بەم شێوەیە وەڵامیان دایەوە:

- تەنها ڕێگە بەتۆ دەدەین تەواف بکەیت. بەڵام بەهیچ شێوەیەك ڕازی نابین ئەوانی تر پێ بخەنە ئەم شارەوە.

حەزرەتی عوسمان بە دەنگێکی پڕ لە دڵنیاییەوە پێی فەرموون:

- بێ پێغەمبەری خوا هەرگیز تەوافی کەعبە ناکەم.

لەم کاتەشدا هاوەڵان لە چاوەڕوانیدا بوون. بە درەنگ کەوتنی حەزرەتی عوسمانیش پەرۆشییان زیاتری کرد. پاشان دەنگۆی کوژرانی حەزرەتی عوسمان بڵاوبووەوە. ئەم هەواڵەش پەرۆشییەکەیانی گەیاندە تووڕەیی. هەر بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ هاوەڵانی کۆکردەوە. هەموویان بەنۆرە دەستیان خستە سەر دەستی پێغەمبەری خوا و پەیمانیان دا تا مردن لەگەڵ پێغەمبەری خوادا بن. لە کۆتاییدا پێغەمبەری خوا دەستی خستە سەر دەستەکەی تری فەرمووی:

- ئەمە دەستی منە، ئەوی تریش دەستی عوسمانە. لەبەر ئەوەی عوسمان کاری خوا و پێغەمبەرەکەی ڕادەپەڕێنێت.

هاوەڵان کە ئەمەیان بینی بۆیان دەرکەوت کە پێغەمبەری خوا ﷺ چەندە گرنگی بە حەزرەتی عوسمان دەدات.

ئینجا کاتی ڕۆیشتن بەرەو مەککە هات. جگە لە شمشێرەکانیشیان هیچی تریان پێ نەبوو. بەم شێوەیەش هێرش کردنە سەر مەککە کارێکی ترسناك بوو. بەڵام هاوەڵان کەسیان نەدەترسان.

کاتێك خەڵکی مەککە سووربوونی موسوڵمانەکانیان بینی، ترسان و هەموویان بۆ تاووتوێ کردنی بارودۆخەکە کۆبوونەوە. پاشان بڕیاریاندا حەزرەتی عوسمان ئازاد بکەن.

کاتێک موسوڵمانان حەزرەتی عوسمانیان بەسەلامەتی بینی زۆر دڵخۆش بوون. بێباوەڕان نوێنەرێکیان نارد بۆلای پێغەمبەری ئازیزمان. لە کۆتاییشدا گەیشتنە ئەنجام.

* * *

# پڕقازانجترین بازرگانی

قاتوقڕییەکی ترسناک باڵی بەسەر مەدینەدا کێشابوو. خەڵك هیچی دەست نەدەکەوت بیخوات. جا لە دەمی ئەم ناڕەحەتییانەدا دەنگێك بیسترا:

- وا کاروانەکەی عوسمان دێت، وا کاروانەکەی عوسمان دێت!

هەموو خەڵك بەئومێدەوە دەستیان بەچاوەڕوانی کرد، چونکە ئەم کاروانە باری سەدان وشتر گەنمی تێدا بوو. حەرزەتی عوسمان کە بە بەخشندەییەکەی ناوی دەرکردبوو، خۆ هەر هیچ نەبووایە بەشی ئەو کەسانەی لێدەدا کە گوزەرانیان زۆر خراپ بوو.

پاشان هەندێ لە بازرگانە پیسکەکانی گەنم، هیچ بەم هەواڵە دڵخۆش نەبوون و دەیانویست پێش ئەوەی کاروانەکە بگاتە ناو شارە ئەمان بە هەرزان لە حەزرەتی عوسمانی بکڕنەوە و پاشان بەگرانتر بە خەڵکی بفرۆشنەوە. بۆیە بێ کات بەفیڕۆدان کەوتنە ڕێ. لە دەرەوەی شار بە کاروانەکە گەیشتنەوە. دواتر حەزرەتی عوسمانیان دۆزیەوە و پێیان وت:

- هاتوین بۆ ئەوەی گەنمت لێبکڕین، عوسمان.

حەزرەتی عوسمان بەدەنگێکی پڕمتمانەوە وەڵامی دانەوە:

- ئەم گەنمانە نافرۆشم!

- نایفرۆشیت؟ بەڵام بۆچی؟

- نایفرۆشم و ئەھ.

- باشە، حەوت ئەوەندەی نرخی خۆیت دەدەینێ.

حەزرەتی عوسمان دیسانەوە فەرمووی:

- نایفرۆشم.

- باشە، ئاخر بۆ نایفرۆشیت؟

- چونکە یەکێك هەیە لە ئێوە زیاترم دەداتێ. بەوی دەدەم، بە ئێوەی نافرۆشم.

بازرگانەکان نەیاندەزانی چی بڵێن. بۆیە نرخەکەیان زیاتر کرد، بەڵام حەزرەتی عوسمان سوور بوو لەسەر بڕیارەکەی و فەرمووی:

- نایفرۆشم. پێم وتن کە یەکێك لە ئێوە زیاترم دەداتێ. بەوی

دەفرۆشم.

بەم شێوەیە نەیانتوانی حەزرەتی عوسمان قایل بکەن. بۆیە چوونە لای ئەبوبەکری پێشەوای موسوڵمانان و سکاڵای خۆیان لای ئەو کرد:

- ئەی ئەبوبەکر، ئاگات لەو کارە هەیە کە عوسمان بە ئێمەی دەکات؟

- ؟

- چەندە پارەمان پێدا، ئەو هەر گەنمەکەی پێ نەفرۆشتین. ئایا ئەمە کارێکی باشە کە عوسمان لەم قات و قڕییەدا دەیکات؟

حەزرەتی ئەبوبەکر کەمێك بیری کردەوە، ئینجا ڕووی تێکردن و فەرمووی:

- عوسمان زاوای پێغەمبەری خوایە و هاوڕێی بەهەشتیەتی، ئێوە بەهەڵە لێی تێگەیشتوون، عوسمان شتی وا ناکات.

بازرگانەکان زۆر لەسەر قسەی خۆیان سوور بوون، بۆیە هەموو پێکەوە هەستان و چوونە لای عوسمان. حەزرەتی ئەبوبەکر هەموو شتێکی بۆ عوسمان باسکرد و فەرمووی:

- عوسمان، قسەی ئەمانە ڕاستە؟

حەزرەتی عوسمان زەردەخەنەیەکی کرد و سەیرێکی ئەملاو لای کرد، پاشان بە ڕەوشتێکی بەرزەوە فەرمووی:

- بەڵێ، ڕاستە، ئەمانە ویستیان گەنمەکەی من بکڕن. بەڵام من بەیەکێکم فرۆشت کە لەمان زیاتری پێدام.



- کێیە ئەو کڕیارە؟

حەزرەتی عوسمان بەیەك وشە وەڵامی دانەوە:

- خوای باڵادەست!

- !

- بەڵێ، من گەنمەکەم بە خوا فرۆشت، چونکە ئەو یەك بە حەوت سەد لێی وەرگرتم. ئێستاش با خەڵك کۆببنەوە، هەموو گەنمەکە لەڕێی خوادا دابەش دەکەم.

حەزرەتی عوسمان فەرمانی کرد تا خزمەتکارەکانی گەنمەکە بەسەر خەڵکە کەمدەرامەتەکاندا دابەش بکەن. هەر بەمەشەوە نەوەستا، بەڵکو هات و هەموو وشترەکانی کاروانەکەی سەربڕی و گۆشتەکەی دابەش کردن.

حەزرەتی ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێت) بە بینینی ئەم کارە زۆر ئاسوودە بوو. ناوچەوانی حەزرەتی عوسمای ماچ کرد و بۆ پیرۆزبایی لێکردنی فەرمووی:

- من هەر زوو پێم وتن کە لەوتەکانی تۆ بەهەڵە تێگەیشتوون.

بۆ ڕۆژی دواتر حەزرەتی ئەبوبەکر بە حەزرەتی عوسمانی فەرموو:

- ئەم شەو لەخەومدا پێغەمبەری خوام بینی. جوانترین پۆشاکی لەبەرکردبوو و زۆر دڵخۆش بوو. یەك دەستە گوڵیشی پێبوو. پێم وت: ”ئەی پێغەمبەری خوا لەکوێوە دێیت؟“ زەردەخەنەیەکی کرد و فەرمووی: ”لەلای عوسمانەوە دێم. ئەو خێرێکی زۆر گەورەی ئەنجام داوە، خوداش خێرەکەی ئەوی قبووڵ فەرمووە.“

حەزرەتی عوسمان (ڕەزای خوای لێبێت) بەم هەواڵە زۆر دڵخۆش بوو. لەسایەی بەخشندەییەکەیدا دیسانەوە توانی دڵی پێغەمبەری خۆشەویست شاد بکات. خۆ هەر پێغەمبەری خوا خۆی کە لە ژیاندا بوو، بەم شێوەیە باسی حەزرەتی عوسمانی دەکرد و دەیفەرموو: ”عوسمان خێرەومەندترین و بەخشندەترینی ناو ئوممەتەکەمە.“

* * *



# خاکێتی

ڕۆژێکیان سەروەرمان فەرمووی: "هەر کەسەو لە بەهەشتدا برادەرێکی هەیە. برادەری منیش حەزرەتی عوسمانە." سەرەڕای ئەوەی کە حەزرەتی عوسمان مژدەی بەهەشتیشی پێدرابوو، کەچی ئەو ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر لەسەر خوا پەرستی سوور دەبوو. ئەوە بوو شەو تا بەیانی قورئانی دەخوێندەوە و خوا پەرستی دەکرد.

شەوێکیان دووبارە لە جێگەکەی هەستا و بۆ نوێژکردن چووە دەرەوە. لە کاتێکدا خەریکی ئامادەکردنی ئاوی دەستنوێژ بوو، یەکێك

لە ئەندامانی خێزانەکەی ئاگای لە حەزرەتی عوسمان بوو. بۆیە هاتە لایەوە و پێی وت:

- با بەخزمەتکارەکانت بوتایە. ئەوان ئاویان بۆ دەهێنایت.

حەزرەتی عوسمان هەرگیز بە وەها کارێك ڕازی نەدەبوو، بۆیە وتی:

- نەخێر، شتی وا چۆن دەبێت. شەو کاتی حەوانەوەی خۆیانە، چۆن دەبێت من پێ بنێم بەم مافەیاندا.

هەموان دەیانزانی کە ژیانی تایبەتی حەزرەتی عوسمان زۆر لەوە جیاوازترە کە دەردەکەوێت. هەرگیز دەوڵەمەندییەکەی نەبووە هۆی لەخۆبایی بوون و هەمیشە وەکو تاکێکی هەژاری ناو موسوڵمانان دەژیا.

پاش ئەوەش کە بوو بە سەرکردەی دەوڵەتی مەزنی ئیسلام، هیچ نەگۆڕا و لەسەر ژیانی پێشووی خۆی بەردەوام بوو. بۆیە خەڵکی چۆن بژیانایە، ئەویش بە هەمان شێوە دەژیا.

کارەکانی حەزرەتی عوسمان بۆ ئەوە نەبوو تا خۆی لای خەڵکی خۆشەویست بکات. بەڵکو هەموو هەڵسوکەوتەکانی لە باوەڕی تەواوی بە خوای گەورە و ئەو وانە بەپێزانەوە سەرچاوەی گرتبوو کە لە پێغەمبەری خواوە فێریان ببوو.





# پیرەمێردی ڕۆحسوک

منداڵێکی بچکۆلانە لەنزیک مزگەوتەکەی پێغەمبەری خواوە باڵندەی هەڵدەفڕاند. بە پۆشاکەکانیدا دیاربوو کەسێکی هەژارە. لە دەمی یاریکردندا پیاوێکی بینی کە لەولاوە خەوی لێکەوتووە،

ئەمیش لەناکاو وەستا و بەخێرایی لێی نزیك بووەوە.

پیاوەکە لە شیرینی خەودا بوو. پیرەمێردێکی سەر و ڕیش پڕ بوو کە چەند هێڵێکی شوێنەواری دڕکەومێکوتە بە دەموچاویەوە دیار بوو. لەم بارەدا هێندە ڕۆحسوك دەهاتە پێش چاو، منداڵەکە باڵندەکانی لەبیر چووەوە و کەوتە تەماشاکردنی ئەم مامەپیرەیە.

مامە پیرەش یەکسەر خەبەری بووەوە و چاوەکانی کردەوە. بەبێدەنگیی سەیرێکی منداڵەکەی بەرامبەری کرد. منداڵەکە هێشتا واقی وڕمابوو.

پیرەمێردەکە وتی:

- تۆ کێیت ڕۆڵە؟

منداڵەکە بەبیستنی دەنگەکە هاتەوە هۆش خۆی و بۆی دەرکەوت کە مامە پیرەکە خەبەری بووەتەوە:

- کوڕی سەعیدم.

پیرەمێردە ڕۆحسوکەکە زەردەخەنەیەکی کرد و خۆی ڕێك کردەوە. ماوەیەکی چاك بەچاوی پڕسۆزەوە تەماشای منداڵەکەی کرد. لەدواییدا هاواری لە گەنجێک کرد کە ئەویش کەمێک لەولاترەوە خەوی پێدا کەوتبوو. بەڵام گەنجەکە لە خەوێکی قوڵدا بوو. لەوە نەدەچوو بە بانگ کردن خەبەری بێتەوە. لەپای ئەمە مامەپیرە بە منداڵەکەی وت:

- بڕۆ، بەخەبەری بهێنە.

منداڵەکەش بە قەڵەمبازێك خۆی گەیاندە لای گەنجەکە و

ڕایوەشاند و بەخەبەری هێنا. ئینجا پێی وت کە مامەپیرە بانگی دەکات. لاوەکە بەشێوازێك کە ڕێزی لێدەباری ڕایکرد و خۆی گەیاندە لای پیرەمێردەکە. مامەپیرەش شتێکی بەگوێدا چرپاند. گەنجەش پاش ئەوەی زۆر بە وردی گوێی بۆ ڕاگرت، هەستا و بەڕاکردن دوور کەوتەوە. منداڵەکەش بە تاسەوە سەیری ئەو ڕووداوانەی دەوروبەری دەکرد.

زۆری پێنەچوو گەنجەکە گەڕایەوە. لە گەڵ خۆشیدا کیسەیەك و دەستێ جلی تازەشی هێنابوو. مامەپیرە منداڵەکەی بانگ کردە لای خۆی و بە دەستی خۆی جوان جوان جلەکانی کردە بەری. ئینجا کیسەکەشی دایە دەستی و پێی وت:

- دەی ڕۆڵەگیان، ئێستا دەتوانیت بڕۆیت.

منداڵەکە تەماشایەکی جلەکانی بەری کرد و لە خۆشیدا ڕووی گەش گەش بووەوە. پاشان بە ڕاکردن لەوناوە دوورکەوتەوە. چوو باوکی دۆزیەوە و بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوە. باوکی لەم کارە سەری سوڕمابوو. بەیەکەوە کیسەکەیان کردەوە، پڕ بوو لە پارە. کوڕەکە دەستی کرد بە باسکردنی پیرەمێردەکە. ئینجا باوکی زەردەخەنەیەکی کرد و وتی:

- کوڕی خۆم ئەوە پێشەوای موسوڵمانانە، عوسمانی کوڕی عەففان.



# بەخشین

کاتێك حەزرەتی عوسمان بووە جێنشینی موسوڵمانان، خەڵکی زۆر بەئاسانی دەیانتوانی سەردانی بکەن و چاویان پێی بکەوێت. ئەوانەی کە دەهاتن هەندێکیان باسی پێداویستییەکانی خۆیانیان بۆ دەکرد و هەندێکی تریشیان ئەو پرسیارانەی ببوە خولیای سەریان لێیان دەکرد و وەڵامی خۆیان وەردەگرت.

ڕۆژێکیان لە دەرگا درا. پیاوێك هاتە ژوورەوە کە هەر بەڕواڵەتیدا دیاربوو زۆر ناڕەحەت بوو. سڵاوی کرد. پاشان حەزرەتی عوسمانیش وازی لە کاری بەردەستی هێنا و وەڵامی سەلامەکەی دایەوە و پێی فەرموو:



- فەرموو برای خۆشەویستم. گوێم لێتە.

کابرا دانیشت. ئینجا دوای ئەوەی هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشا، دەستی کرد بە باسکردنی کێشەکەی و وتی:

- کاتێك لە باخەکەمدا نوێژم دەکرد، گوێبیستی دەنگی باڵندەیەك بووم. بەڕاستی بە ئاوازێکی زۆر خۆش دەیخوێند. ئینجا منیش بەچاو دەستم کرد بەگەڕان بەدوایدا. بینیم وا ڕێك لەسەر

لقی دارەکەی بەرامبەرم نیشتووەتەوە. هەروەها جوانییەکەشی هێندەی دەنگی ناوازە بوو. بەسەرسامییەوە سەیرم دەکرد تا ئەوەی لە ناکا و فڕی و ڕۆیشت. ئیتر ئەو کاتە بیرم کەوتەوە کە من نوێژم دەکرد.

حەزرەتی عوسمان لە لایەکەوە بەتاسە و سەرسووڕمانەوە گوێی لە کابرا دەگرت. لەلایەکی تریشەوە دەیویست بزانێت قسەکانی کابرا بەکوێ دەگات. پیاوەکەش زۆر درێژەی نەدایە و وتی:

- جوانی و ڕازاوەیی باخەکەم منی لە نوێژەکەم کرد، منیش بەم کارە زۆر دڵتەنگ بووم. بۆیە ئێستا دەمەوێت لەبری ئەم گوناهە چاکەیەك بکەم. دەمەوێت ئەم باخچەیە لە ڕێی خوادا ببەخشم. تکات لێدەکەم، ئەم باخچەیەم لێوەرگرە و چۆن دەتەوێت بەکاری بهێنە.

حەزرەتی عوسمان نەیدەزانی چۆن وەڵامی ئەم پیاوە بەڕێزە بداتەوە. چونکە لە ڕاستیدا چاوەڕێی هەڵسوکەوتێکی لەم جۆرەی لێنەدەکرد. بۆیە کاتێک بینی کابرا زۆر دڵتەنگە، ناچار بوو ئەو داواکارییەی قبووڵ بکات. ئەوە بوو باخەکەی کردە خێر و حەزرەتی عوسمانیش خستییە فرۆشتنی ئاشکراوە و بە نرخێکی باش فرۆشتی و پارەکەشی بۆ خزمەتی موسوڵمانان بەکار هێنا.

* * *



# زۆرکردنی قورئان

لەسەردەمی دەسەڵاتی حەزرەتی عوسماندا زۆر شوێن فەتح کران و لە ماوەیەکی زۆر کورتدا سنووری دەوڵەت گەشتە ناو ئەورووپا و ئاسیا و ئەفریقا.

حەزرەتی عوسمان (ڕەزای خوای لێبێت) هەر بەمانەوە نەوەستا، بەڵکو دەیویست دورگەکانی ناو دەریاش فەتح بکات. بۆیە نەدەبوو شوێنێك بمێنێتەوە کە زایەڵەی ئایینی خوای لێنەبیسترابێت. بەم

مەبەستەش دەستی کرد بە ئامادەکاری. تا وای لێهات هێزی سوپا لە دەریاشدا دەرکەوت.

ئیتر بە گەورەبوونی دەوڵەت خەڵکیش دەوڵەمەند بوو. لە هەموو لایەکەوە دەستکەوت دەهات و بەسەر خەڵکیدا دابەش دەکرا. بەڵام ئەم گەورەبوونەش چەندین کێشەی لەگەڵ خۆیدا هێنایە کایەوە. ئەوانەی لە وڵاتە تازە فەتح کراوەکاندا موسوڵمان دەبوون، دەیانویست بەزووترین کات فێری قورئان ببن. بۆیە دەهاتن ئاستی قورئان فێربوونی خۆیان لەگەڵ یەکتریدا بەراورد دەکرد و و هەندێک جار بارگرژی لەنێوان خۆیاندا ڕوویدەدا و دەیانوت: "خوێندنەوەکەی من ڕاسترە، خوێندنەوەکەی تۆ هەڵەی تێدایە."

یەکێك لەهاوەڵان هەستی بەم بارودۆخە کرد، بۆیە یەکسەر چووە لای حەزرەتی عوسمان و پێی وت:

- ئەی پێشەوای باوەڕداران، وا هەندێك لە موسوڵمانان جارجار لەسەر شێوازی قورئان خوێندن دەبێت بە دەمەقاڵەیان. نەوەك ئێمەش وەك یەهودی و مەسیحیەکان ببێت بەناکۆکیمان لەسەر کتێبی خوای گەورە. با بەزووترین کات ڕێگەچارەیەك بۆ ئەم کێشەیە بدۆزینەوە.

حەزرەتی عوسمان خۆی کەسێك بوو هەمیشە شەیدای قورئان بوو. بۆیە یەکسەر بۆ ڕاپەڕاندنی ئەم کارە قۆڵی لێهەڵماڵی. خێرا یەکێکی نارد بۆ لای دایکی ئیمانداران، حەزرەتی حەفصە و پێی وت:

- قورئانێکی نوسراوی سەردەمی حەزرەتی ئەبوبەکر لای جەنابت هەیە. تکایە بۆمان بنێرە. چەند دانەیەکی تری لەبەر دەگرینەوە و دەینێرین بۆ چواردەورمان.

حەزرەتی حەفصەی دایکی ئیماندارانیش لەسەر ویستی پێشەوای باوەڕداران قورئانەکەی بۆ نارد. ئیتر ئەوەبوو لەماوەیەکی کەمدا شەش دانەی تریان لەبەر ئەو قورئانە نووسییەوە. لەکاتی نووسینەوەدا زۆر بەوردی و ئاگادارییەوە کاریان دەکرد تاکو خاڵێك چییە لەگەڵ ئەوانەی تردا جیاوازییان نەبێت.

پاشان یەکێك لە قورئانەکانیان لە مەدینە دانا و ئەوانەی تریان نارد بۆموسوڵمانانی شارەکانی دەوروبەریان.

ئەمەش بە دەستکەوتێکی گەورە دادەنرێت لە مێژووی پڕ سەروەری ئیسلامدا. چونکە لەو ڕۆژە بەدواوە قورئانی پیرۆز لەبەری نوسرایەوە و وای لێهات لە هەموو ماڵێکدا هەبێت.

* * *



# نامە

کاتێک ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز بە وەحی بۆ سەر پێغەمبەرمان دادەبەزین، ئەوا یەکسەر پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵان لەبەریان دەکرد. بەڵکو تەنها بەمەشەوە نەدەوەستان و بێ کات بەفێرۆدان ئایەتەکانیان دەنوسیەوە. بۆیە هاوەڵان ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزیان

لەسەر گەڵای دارخورما و بەردی ڕوون و پێستەی ئاسک دەنووسیەوە. ئەو کەسانەش کە بەم کارە هەڵدەستان ئەوانە بوون کە خوێندنەوە و نووسینیان باش دەزانی.

کەسێك هەبوو بەناوی مەڕوان. ئەم پیاوە خوێندنەوە و نوسینی دەزانی و پێغەمبەری خوا ﷺ کردبووی بە نوسەری وەحی. هەندێك لەو ئایەت و سورەتانەی بۆی دادەبەزین بەوی دەنوسیەوە.

جارێکیان سورەتێکی تر دابەزی و پێغەمبەری خواش ﷺ لەسەر نەریتی خۆی داوای کرد بنووسرێتەوە. مەڕوان یەکسەر پێنووسی گرتە دەست. پێغەمبەری خواش ﷺ ئایەتەکانی دەخوێندەوە و ئەویش دەینووسی. لە کۆتاییدا سورەتەکە تەواو بوو. کە کاتی نووسینی ناوی ئایەتەکە هات، پێغەمبەری خوا پێی فەرموو کە سورەتەکە ناوی "آل عمران"ە.

مەروان وەستا و خەیاڵی چوو بەلای وشەی "عمران"ەوە. ئینجا بیری لە ناوی خۆی کردەوە کە "مروان" و "عمران" لە یەکەوە نزیکن. لە دڵی خۆیدا وتی: با "لەبری "آل عمران" بنووسم "آل مروان"." "آل مروان" بەمانای خێزانی مەروان یاخود تیرەی مەروان دەهات. هەر بەو شێوەیەشی کرد کە بیری لێکردبووەوە.

پێغەمبەری خواش ﷺ هەستی بەم بارودۆخە کرد، چونکە خوای گەورە خۆی بەڵێنی پاراستنی قورئانی پیرۆزی دابوو کە تا ڕۆژی قیامەت ڕێ نادات تەنانەت یەك وشەشی لێبگۆڕدرێت. بۆیە یەکسەر مەڕوانی وەستاند و بەتووڕەییەوە ئەم وشانەی پێ وت و لە مەدینە دەری کرد:

- ناکرێت لەمەودوا تۆ لەناوماندا بیت.

لە ڕاستیدا مەڕوان خراپەیەکی زۆر گەورەی ئەنجام دا. بۆ ئەوەی باجی کارەکەشی بدات دەبوایە مەدینە جێبهێڵێت.

چەند ساڵێکی زۆر بەسەر ئەم بەسەرهاتەدا تێپەڕیبوو و پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی کردبوو. حەزرەتی ئەبوبەکریش (ڕەزای خوای لێبێت) لەجێی پێغەمبەری سەروەر ببوە جێنشینی موسوڵمانان. ئیتر ئەو کاتە مەڕوان داوای مۆڵەتی گەڕانەوەی لە حەزرەتی ئەبویەکر کرد، بەڵام مۆڵەتی پێنەدا.

حەزرەتی ئەبوبەکریش پاش دوو ساڵ وەفاتی کرد و حەزرەتی عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) هاتە جێی. مەڕوان بە هەمان شێوە داوای مۆڵەتی گەڕانەوەی لەویش کرد، بەڵام ئەویش مۆڵەتی نەدا. حەزرەتی عومەر هەر بەمەوە نەوەستا، بەڵکو ناردی بۆ شوێنێکی دوورتر.

کە حەزرەتی عوسمان بوو بە خەلیفە، مەڕوان زۆر دڵخۆش بوو، لەبەر ئەوەی دەیزانی حەزرەتی عوسمان کەسێکی دڵ نەرمە.

بۆیە یەکسەر خۆی کۆکردەوە و چوو بۆلای حەزرەتی عوسمان، زۆر لێی پاڕایەوە و خۆیدا بەسەر قاچیدا.

حەزرەتی عوسمان (ڕەزای خوای لێبێت) بە بینینی ئەم حاڵەی بەزەیی پیادا هاتەوە. چونکە مەڕوان بەڕووخساریدا وا دیاربوو کە بەڕاستی لە کارەکەی پەشیمانە. بەم شێوەیە لەو ڕۆژە بەدواوە مەڕوان لە مەدینە دەستی کرد بە ژیان. زوو زوو سەردانی حەزرەتی

عوسمانی دەکرد و جێگەی خۆی لە دڵیدا کردەوە. دوای ماوەیەکیش حەزرەتی عوسمان کردی بە نوسەری خۆی.

ئەوەندەی نەبرد کۆمەڵێك لە میسرەوە هاتن. باسی ئەوەیان کرد کە والیەکەیان بەدڵ نییە. حەزرەتی عوسمانیش یەکە یەکە گوێی لە سکاڵاکانیان گرت. پاشان فەرمووی:

- باشە، من والیەکەتان بۆدەگۆڕم. پێم بڵێن لەشوێنی ئەو کێتان دەوێت؟

- موحەممەدی کوڕی حەزرەتی ئەبوبەکر بۆ ئەم کارە شیاوە.

حەزرەتی عوسمان (ڕەزای خوای لێبێت) پاش ئەوەی ڕای دەوروبەری وەرگرت، داواکارییەکەیانی جێبەجێ کرد. بۆیە یەکسەر مەڕوانی نووسەری بانگ کرد و فەرمووی بنووسە: "ئەی خەڵکی میسر، ئەوا من والیەکەی ئێوەم گۆڕی و لە شوێنی ئەو موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکرم دانا."

مەڕوان زۆر لە حەزرەتی ئەبوبەکر تووڕە بوو، چونکە لەسەردەمی دەسەڵاتی ئەودا نەیهێشت بگەڕێتەوە بۆ مەدینە. تەنها بەو هۆیەوە بوو کە حەزرەتی عومەریش مۆڵەتی گەڕانەوەی نەدابوو و وتبووی: "پێغەمبەری خوا و حەزرەتی ئەبوبەکر مۆڵەتیان پێنەداوە منیش مۆڵەتی پێنادەم." مەڕوان لە زووەوە بەدوای هەلێکدا دەگەڕا تۆڵەبسەنێتەوە. دەی وا ئێستا ئەو هەلەی بەدوایدا وێڵ بوو، کەوتە بەردەستی.

مەڕوان بەمێشکی خۆی نامەیەکی تری نووسی: "تۆ ئەی والی

میسر، موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکر دێت بۆ لات و پێت دەڵێت 'تۆ لەسەر کارەکەت لابراویت و من لە شوێنی تۆ دانراوم.' من وازم لە بڕیاری لەسەر کارلابردنی تۆ هێناوە. موحەممەد و هەموو ئەوانە بکوژە کە لەگەڵیدان."

ئەمە پلانێکی زۆر ترسناك بوو. تۆڵە بەرچاوی مەڕوانی تاریك کردبوو و هیچ بیری لەوە نەکردەوە ڕۆژێك دێت ئەم تەڵەکەیەی ئاشکرا دەبێت.

کاری نووسینی نامەکە تەواو بوو. تەنها سەلماندنی ڕاستی و دروستی نامەکە مابوو. بۆ ئەم کارەش پێویستیی بە مۆری حەزرەتی عوسمان دەکرد.

مەڕوان بۆماوەیەك بیری کردەوە چی بکات و چی نەکات. ئیتر لە کۆتایدا پلانی کوشندەی خۆی دارشت و بەدەم خۆیەوە دەیوت: "خەلیفە تەنها لەیەك کاتدا نەبێت هەرگیز مستیلەکەی دانانێت، ئەویش ئەوکاتەیە کە دەچێتە سەرئاو و دەیداتە دەست ئەو کەسەی لەو کاتەدا لێیەوە نزیکە. ئەوەش لەبەر ئەوەی ناوی خوا لەسەر مستیلەکەی نووسراوە. هەر بۆیە نابێت لەمەودوا ساتێك لە عوسمان دوور بکەومەوە."

مەڕوان هیچ بیری لەو زیانانە نەدەکردەوە کە لە دەوڵەتی ئیسلامی دەکەوتن. بەڵکو تەنها بیری لەوە دەکردەوە کە تۆڵەی خۆی لە حەزرەتی ئەبوبەکر بکاتەوە.

بۆیە خۆی گەیاندە لای حەزرەتی عوسمان و لەوێ خۆی بە شتێکەوە سەرقاڵ کرد تا لە کۆتاییدا حەزرەتی عوسمان هەستا بۆ

ئەوەی بچێت دەستنوێژەکەی تازە بکاتەوە، ئەوەبوو مستیلەکەی دایە دەست مەڕوان و ڕۆیشت.

مەڕوان ئەوەندە شڵەژابوو نەیدەزانی چی بکات. ئەم کارە زۆر لەوەی بیری لێدەکردەوە ئاسانتر بۆی ڕێکەوت. بۆیە خۆی کۆکردەوە و نامەکەی مۆر کرد و دایە دەست نامەبەرەکەی خۆی کە متمانەی پێدەکرد و وتی:

- زۆر بەپەلە ئەم نامەیە بگەیەنە دەست والی میسر. دەبێت پێش ئەو کۆمەڵەیە و موحەممەد بگەیت. بەڵام ئەگەر بە پێچەوانەوە بێت ئەوا هەموو شتێك هەڵدەوەشێتەوە.

نامەبەرەکەشی بە زۆرزانیەکەوە پێکەنی و وتی:

- خەمت نەبێت، هەر ئێستا دەبم بە باڵندە و دەفڕم. پێش ئەوان دەگەمە میسر و نامەکە دەگەیەنم.

نامەبەرەکە ڕۆیشت و مەڕوانیش هاتەوە ژوورەوە. پاش ماوەیەکی کەمیش کە حەزرەتی عوسمان گەڕایەوە ژوورەوە مەڕوان مستیلەکەی پێدایەوە و ئەویش کردیەوە پەنجەی و دەستی بەکارەکانی کردەوە.

موحەممەدی کوڕی حەزرەتی ئەبوبەکر (ڕەزای خوا لە هەردوکیان بێت) لەگەڵ کۆمەڵەکەی میسر بە کاروانێك کەوتبوونە ڕێ. باش نزیك بوبوونەوە، بۆیە لەسەر گردێك کاروانیاین خست و مۆڵیان بە ئاژەڵەکانیان دا. لەم کاتانەدا یەکێکیان بینی کە بە خێرایی بەرەو لایان دێت. ئەمە هەموانی خستە گومانەوە. بۆیە بڕیاریان دا چاوەڕێی کابرا بکەن. بەڵام لەم کاتەدا شتێك ڕووی دا کە چاوەڕێیان

نەدەکرد؛ ئەو پیاوە بە بینینی ئەمان یەکسەر ڕێگەکەی گۆڕی. ئەمانیش هەستیان کرد کە ئەم ماستە موویەکی تێدایە.

محمد سەربازەکانی نارد بەدوایدا. دوای ماوەیەك پیاوەکەیان گرت. قۆڵیان گرت و بەزۆر هێنایان بۆ لای کاروانەکە. سەرتاپای کابرایان پشکنی، بەڵام هیچیان نەدۆزییەوە. تا لە کۆتاییدا یەکێکیان مەتارەکەی پشکنی و نامەکەی دۆزییەوە.

کە نامەکە خوێنرایەوە هەموو واقیان وڕما. چۆن حەزرەتی عوسمان کارێکی وەها دەکات. کەس نەیدەویست باوەڕ بەمە بکات. بەڵام مۆری خەلیفەی پێوەبوو.

بۆیە کاروانەکە ڕێڕەوی خۆی گۆڕی و بۆ لێپرسینەوە لەم کارە بەرەو مەدینە گەڕانەوە.

لە کۆتاییدا گەیشتنەوە مەدینە. دووڕووەکانیش کە ئەمەیان بینی یەکسەر چوونە لایان. قەرەباڵغییەکە لە ماوەیەکی کەمدا زۆر زیادی کرد. هەموو پێکەوە چوون بۆ لای حەزرەتی عوسمان. لەدوای گفتوگۆیەکی زۆر گەیشتن بە ئەنجام و تێگەشتن کە ئەم تەڵەکەیە مەڕوان دایڕشتووە، بۆیە کۆمەڵێك بە توڕەییەوە وتیان:

- ئەی عوسمان! ئەم هەواڵدەرە هەواڵدەری تۆیە. ئەو وشترەی کە سواری بووە هەر هی تۆیە. مۆری سەر نامەکەش هەر هی تۆیە... هەرچەندە بۆمان ڕوون بوەتەوە کە ئەمە کاری مەڕوانە. بەڵام لەبەر ئەوەی ئەم شتانە بەسەر تۆدا تێپەڕیون و تۆ بوویتە هۆکاری ئەم ڕووداوە، دەبیت واز لە دەسەڵات بهێنیت.

حەزرەتی عوسمان (ڕەزای خوای لێبێت) بەم داواکارییەیان ڕازی نەبوو. چونکە چەند ساڵێك لەوەوپێش پێغەمبەری خوا ﷺ پێی ڕاگەیاندبوو کە کارێکی وا ڕوو دەدات و فەرمووبووی:

"ئەی عوسمان، خوای گەورە کراسێك دەکاتە بەرت. دووڕووانیش داوات لێدەکەن ئەو کراسە داکەنیت. هەرگیز نەکەی ئەو کراسە دابکەنیت. گەر بەقسەی ئەوان بکەیت ئەوا هەتا وشتر بە کونی دەرزیدا تێنەپەڕێت بەهەشت نابیت."

یاخیبووان کە بۆیان دەرکەوت حەزرەتی عوسمان نیازی ئەوەی نییە بەهیچ شێوەیەك واز لە خەلافەت بهێنێت، هێرشیان کردە سەر ماڵەکەی. بەڵام حەزرەتی عوسمان (ڕەزای خوای لێبێت) نەیهێشت هیچکام لەو کەسانە بێنە دەست کە بۆ پارێزگاریکردنی حەزرەتی عوسمان و ماڵەکەی لەدژی یاخیبووان ئامادە بوون. چونکە نەیدەویست بەهیچ شێوەیەك لە شاری پێغەمبەردا خوێن بڕژێت. ڕووی کردە ئەو کۆیلانەشی کە ئامادە بوون لەپێناویدا گیانی خۆیان بەخت بکەن و فەرمووی:

- ئەوەی واز لە چەکەکەی بهێنێت ئازادی دەکەم و دوعای خێریشی بۆ دەکەم.

ئەم قسەیە لەلایەکەوە فەرمانیش بوو. ئەوانەی لەوێدا بوون هەموو چەکەکانیان دانا. بەڵام حەزرەتی عەلی کە ئەم هەواڵەی بیست، کوڕەکانی بانگ کردە لای خۆی و پێی فەرموون:

- ئەوەی ویستی خراپە بەرامبەر عوسمان بکات شمشێرەکانتان دەربهێنن و بیکوژن. ڕێگەش بە کەس مەدەن بچێتە ژوورەوە.

هەردوو نەوە نەبەردەکەی پێغەمبەریش شمشێرەکانیان بەست و دەرچوون. لەبەردەم ماڵی حەزرەتی عوسماندا بە شمشێری هەڵکێشراوەوە ڕاوەستان. بۆیە کەس نەیوێرا بێت بەو ناوەدا یاخود بچێتە ماڵیانەوە.

* * *



# من شەهیدم

وا دیاربوو یاخیبووان نیازی چۆڵکردنی بەردەم ماڵی حەزرەتی عوسمانیان نەبوو. خەڵکی مەدینەش خۆیان خزاندبووە ماڵەکانیانەوە و بە خەمبارییەوە چاوەڕوان بوون. ژمارەی یاخیبووان زۆر بوون.

حەزرەتی عوسمانیش لەماڵەکەی خۆیدا زۆر لەسەرخۆ دەجوولایەوە. وەك نەریتی هەمیشەیی خۆی دیسان قورئانی دەخوێندەوە.

جارێکیان تینووی بوو، بەڵام یەك دڵۆپ ئاو لە ماڵیاندا نەبوو. نەشی دەتوانی لە دەرەوە ئاوبێنێت، لەبەر ئەوەی یاخیبووان ڕێگەیان بە چوونە دەرەوەی نەدەدا. چووە سەربانی ماڵەکەی و بانگی لە یاخیبووانی خوارەوە کرد:

- ئەی میسرییەکان، با ئەو پیاوانە بێنە پێشەوە کە هانیان داون.

دوو پیاوی زلە و کەتە چەند هەنگاوێك هاتنە پێشەوە. حەزرەتی عوسمان (ڕەزای خوای لێبێت) سەیرێکی کردن و فەرمووی:

- لە مەدینەدا جگە لە بیری ڕومەمە ئاوی خواردنەوە نەبوو. منیش لەپای ویستی پێغەمبەری خوا ئەو بیرەم بە پارەی خۆم کڕییەوە. کەچی ئێستا ئێوە ناهێڵن بچمە سەر ئەو بیرە و ئاو بخۆمەوە. ئایا ئاگاداری ئەوە هەن کە چ کارێک دەکەن؟

هەردوو پیاوەکە لە یەك کاتدا وەڵامیان دایەوە:

- خوا خۆی دەزانێت کە ئەم قسانەت هەموو ڕاستن.

حەزرەتی عوسمان لەپاش ئەم وەڵامە دووبارە دەستی کردەوە بە قسە کردن:

- مزگەوتی پێغەمبەری خوا بەرتەسك ببوو، پێغەمبەری خوا فەرمووی: "کێ لە بەرامبەر بەدەستهێنانی بەهەشتدا مزگەوتەکەمان فراوان دەکات؟" من ئەو مزگەوتەم فراوان کرد. بەڵام ئێستا ئێوە ناهێڵن من لەناو ئەو مزگەوتەدا نوێژ بکەم. ئایا ئاگاداری ئەوە

هەن کە چ کارێک دەکەن؟

وەڵامی پیاوەکان دیسانەوە هەمان شت بوو:

- خوا خۆی دەزانێت کە ئەم قسانەت هەموو ڕاستن.

حەزرەتی عوسمان هەناسەیەکی قوڵی هەڵمژی و بە دەنگێکی بەرز کە هەموویان گوێیان لێبێت فەرمووی:

- بۆ خوا و ئیسلام قسە بکەن؛ بە ماڵی خۆم لەشکری سەختم ئامادە نەکرد؟

- بەڵێ، تۆ ئامادەت کرد!

- دووبارە بۆ خوا و ئیسلام لێتان دەپرسم؛ ڕۆژێکیان کە لەگەڵ پێغەمبەری خوا و ئەبوبەکر و عومەر لەسەر کێوی ئوحود بووین، لەو کاتەدا ئەم کێوە دەستی کرد بەلەرزین. بەڕادەیەك کە بەرد لە لوتکەی کێوەکەوە تا بنی تلۆر دەبووەوە. هەر بۆیە پێغەمبەری خوا پاژنەپێی کێشا بە کێوەکەدا و فەرمووی:

"ئەی ئوحود ئارام بەرەوە، ئێستا پێغەمبەرێك و ڕاستگۆیەك و دوو شەهید لەسەرت ڕاوەستاون."

پێم بڵێن، ئاگاداری ئەمەش هەن؟

دوو پیاوەکە دیسان وتیان:

- خوا خۆی دەزانێت کە ئەم قسانەت هەموو ڕاستن.

حەزرەتی عوسمان دەستەکانی کردەوە و فەرمووی:

- پاک و بێگەردی بۆ خوای گەورە، پێغەمبەری خوا منی

بەشەهید هەژمار کردووە، سوێند بە خوای کەعبە من شەهیدم!

حەزرەتی عوسمان (ڕەزای خوای لێبێت) گەڕایەوە ژوورەکەی خۆی. لەم کاتەدا هەندێك لەیاخیبووان پەشیمان بوونەوە. بەخەم و خەفەتێکی زۆرەوە قەرەباڵغییەکەیان جێهێشت. بەڵام دیسان هەندێکی تر لەیاخیبووان بەردەم ماڵی حەزرەتی عوسمانیان بەرنەدا.

* * *

# شەڕکردن؟ هەرگیز ڕێنادەم!

حەزرەتی عوسمان لەماڵەکەیدا قورئانی دەخوێند و خێزانەکەی بەچاوێکی پڕ لەفرمێسکەوە سەیری دەکرد. لەم کاتەدا ئەبو هورەیرە هاتە ژوورەوە. یاخیبووەکان نەیانتوانیبوو دەستی بۆ بەرن. ئەمەش لەبەر ئەوەی هاوەڵێك بوو کە هەموو تەمەنی لەگەڵ پێغەمبەری خوادا بەسەربردبوو. ئەبو هورەیرە بەحەزرەتی عوسمانی وت:

- ئەی پێشەوای ئیمانداران، ئیتر دەبێت شەڕ بکەین.

حەزرەتی عوسمان (ڕەزای خوای لێبێت) بە هێمنی سەیری کرد و فەرمووی:

- ئەی ئەبو هورەیرە، کوشتنی هەموو مرۆڤەکانت پێخۆشە، بە منیشەوە؟

ئەبو هورەیرە زۆر بەدڵنیاییەوە وەڵامی دایەوە:

- نەخێر.

حەزرەتی عوسمان زەردەخەنەیەکی خەماوی کرد و فەرمووی:

- کەوابێت شەرمەکە. سوێند بە خوا گەر تەنها یەك کەس بکوژیت وەك ئەوە وایە هەموو مرۆڤەکانت کوشتبێت.

ئەبو هورەیرەش لەهەموو کەس باشتر ئەمەی دەزانی، کەمێك بیری کردەوە و دوای ئەوە ڕۆیشت.

زۆری پێنەچوو عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر هات و وتی:

- ئەی عوسمان، کەسانێکی زۆر لێرە هەن کە ئامادەن پشتت بگرن. ئەگەرچی ژمارەیان لە یاخیبووانیش کەمتر بێت، بەڵام خوا یارمەتیت دەدات. تکات لێدەکەم مۆڵەتمان پێبدە بجەنگێین لەگەڵیاندا!

حەزرەتی عوسمان بێ بیرکردنەوە وەڵامی دایەوە:

- نەکەن کارێکی وا بکەن! ئەوەی بیەوێت لەبەر من خوێن بڕێژێت، ئەوا دەیترسێنم لەو کارە و خوای گەورەی وەبیردێنمەوە.

زوبەیر زۆر ناچارانە دەستی لە شمشێرەکەی دوورخستەوە.

ئەم جارەیان زەیدی کوڕی ثابت هات. زەید یەکێك بوو لە بەناوبانگەکانی مەدینە. بە حەزرەتی عوسمانی وت:

- ئەی پێشەوای موسوڵمانان، ئەنصار لەدەرەوە چاوەڕێی فەرمانی تۆن، دەڵێن: ”با خەلیفەی موسوڵمانان مۆڵەتی شەڕمان پێبدات تا ڕزگاری بکەین لەم یاخیبووانە.“ چی دەڵێیت؟

حەزرەتی عوسمان وەڵامەکەی هەر نەگۆڕیبوو:

- شەڕکردن؟ هەرگیز ڕێگە نادەم!

زەیدیش بە خەمبارییەوە حەزرەتی عوسمانی جێهێشت.

ئەمجارەیان جەنگاوەرێك کە ناوی سەعید بوو هاتە ژوورەوە. تووڕەیی لە چاوانیدا دەخوێندرایەوە، بەتوندی شمشێرەکەی بە دەستەوە گرتبوو. بەحەزرەتی عوسمانی وت:

- ئەی پێشەوای موسوڵمانان

حەزرەتی عوسمان بەسەر سوڕمانەوە سەیری کرد. ئەویش بەردەوام بوو:

- تاکەی ئاوا بەدەست بەسراوی چاوەڕوان بین. ئەم یاخیبووانە قەڵاچۆمان دەکەن. دەی خۆ وا خەریکە دەمانخۆن. یەکێك تیر دەهاوێت و یەکێکی تر بەرد و یەکێك شمشێرەکەی ڕادەوەشێنێت و گاڵتەمان پێدەکات. دە ئیتر فەرمانی جەنگمان پێبدە!

حەزرەتی عوسمان بەدەنگێکی زۆر ناسك وتی:

- منیش دەزانم ئەگەر بەرامبەریان شەڕ بکەم، دەیانبەزێنم. بەڵام بەخوای گەورە من نامەوێت شەڕ بکەم. من خۆیان و ئەوانەش کە هانیان دەدەن حەواڵەی خوای گەورە دەکەم. هەرچۆنێك بێت بەم نزیکانە هەمووومان لەبەردەم خوای گەورەدا کۆدەبینەوە. بەڵام

هەرگیز فەرمان بە شەڕکردن نادەم.

سەعید کەسێکی پشودرێژ و خۆڕاگر نەبوو. ئەو زوڵمەی پێ قبووڵ نەدەکرا کە بەرامبەر پێشەوای موسوڵمانان ئەنجام دەدرا. بۆیە دەستی لە شمشێرەکەی توند کرد و وتی:

- بەخوا باوەڕناکەم لەمەودوا چاوەڕێی بیروبۆچوونی تۆ بکەم لەمەڕ ئەم بابەتە. ئەوە من بە خۆم و شمشێرەکەی دەستمەوە دەڕۆم.

حەزرەتی عوسمان نەیتوانی ڕێی لێبگرێت. سەعید لە چاوتروکانێکدا خۆی گەیاندە دەرەوە و بە تەنیا کەوتە گیان سەدان یاخیبوو. ئەوەی دەهاتە بەردەمی دەیدایە بەر شمشێر. بەڵام لەکۆتاییدا یاخیبووان شەهیدیان کرد.

حەزرەتی عوسمان زۆر بەم بارودۆخە دڵگران بوو. دەی خۆ لە دەرەوە حەوت سەد کەسی وەك سەعید ئامادەبوون لەپێناو حەزرەتی عوسماندا (ڕەزای خوای لێبێت) خۆیان بەخت بکەن و چاوەڕێی ئاماژەیەکی ئەو بوون تا تۆڵە لە دانە بەدانەی یاخیبووان بستێننەوە. بەڵام ئەو ڕێگەی بەوە نەدا و نەیدەویست لەمەدینەدا دڵۆپێك خوێن بڕژێت، بەردەوام دەیوت:

- لە لای من بەنرخترینتان ئەوەیە کە دەستی لەچەکەکەی بەر بدات.



# ڕۆژی پێکشادبوونەوە

یاخیبووان نەیاندەهێشت تەنانەت باڵندەش نزیکی ماڵی حەزرەتی عوسمان بکەوێتەوە. بەچروپڕی ئابلۆقەی ماڵەکەیان دابوو. تیریان هەڵدەدایە ماڵەوە، هەڵدەستان یەخەیان بەوانە دەگرت کە دەیانویست بچنە ژوورەوە.

ئابلۆقەکە چل ڕۆژی ڕەبەقی خایاند. حەزرەتی عوسمان (ڕەزای خوای لێبێت) لەدواهەمین شەودا پێغەمبەری خوای لە خەونیدا بینی. پێغەمبەری خوا ﷺ خەمبار بوو، بەڵام زەردەخەنەی دەکرد. بە خۆشەویستیەوە تەماشای حەزرەتی عوسمانی کرد و فەرمووی:

- ئەی عوسمان، چواردەوری ماڵەکەیان گرتوویت و لێرە بەندیان کردوویت؟

- بەڵێ، ئەی پێغەمبەری خوا!

- ئەی عوسمان، بێ ئاویان کردوویت؟

- بەڵێ، ئەی پێغەمبەری خوا!

پێغەمبەری خوا پەرداخێك ئاوی پێدا و حەزرەتی عوسمانیش نۆشی کرد. هەموو گیانی فێنك بووەوە. لەکۆتاییدا پێغەمبەر لێی پرسی:

- ئەی عوسمان، دەتەوێت بێن بە هاناتەوە، یاخود دەتەوێت بەربانگت لەگەڵ ئێمە بکەیتەوە؟

حەزرەتی عوسمان زۆر بەدڵخۆشیەوە وەڵامی دایەوە:

- دەمەوێت شەهید ببم و لەگەڵ ئێوەدا بەربانگ بکەمەوە ئەی پێغەمبەری خوا.

حەزرەتی عوسمان خەبەری بووەوە. پاشان بەهۆی خەونەکەیەوە دەتوت خەریکە باڵ دەگرێت لە خۆشیدا.

ماوەیەك تێپەڕی. یاخیبووان بەدوای چارەیەکدا دەگەڕان تا بچنە ژوورەوە. لەکۆتاییدا بەدەوری خانووەکەیدا سووڕانەوە و دیواری پشتەوەیان ڕووخاند و چوونە ژوورەوە.

حەزرەتی عوسمان (ڕەزای خوای لێبێت) بەزمانی بەڕۆژووەوە قورئانی دەخوێند. هیچ خۆی تێکنەدا. یاخیبووان ئەو مرۆڤە مەزنە

مژدەپێدراوەی بەهەشتیان لەسەر قورئانەکەی شەهید کرد.

خەلیفەی مەزن ئەو کاتە تەمەنی هەشتا و دوو ساڵ بوو. لە ساڵی دوازدەیەمی دەستەڵاتیدا بە خوای گەورە و خۆشەویستەکەی شاد بووەوە.

* * *

# حەزرەتی
# عوسمان
## ڕەزای خوای لێبێت

حەزرەتی عوسمان (ڕەزای خوای لێبێت) نموونەی باڵای ڕەوشت بەرزی و ئاکاری جوان بوو.

ئەو هەمیشە موڵک و سامان و دەوڵەمەندییەکەی لەپێناو سەرخستنی ئاینی ئیسلام و خزمەتی خەڵکیدا بەکاردەهێنا. هەردەم پێشەنگی ئەو کەسانە بوو کە بۆ بەخشین لەپێشبڕکێدا بوون. هەر ئەو بوو بیری ڕوممەی کڕی و بەخۆڕایی بەخشییە موسوڵمانان تاکو لە تینوێتی ڕزگاریان بکات. بۆیە هەرکەس لە ئاوی سازگاری ئەو بیرەی دەخواردەوە، یاخود گۆزەکەی لێپڕ دەکرد، پڕبەدڵ دوعای خێری بۆ حەزرەتی عوسمان دەکرد.

9 649750 000260
Gül Devri - 4 Hz. Osman

نرخی ٣٠٠٠ دیناره

İRFAN PUBLISHING